# کاروان

• گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە.. ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

٩٣




...ویەکی هونەرمەند چەتۆ حسن

ئاداری ١٩٩٢ ساڵی دەیەم



# کاروان

● گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە.. ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری

ژمارە

٩٣

ئاداری / ١٩٩٢
ساڵی دەیەم

● ئەدرەس:
هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتیی
ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان
گۆڤاری کاروان

● لەم ژمارەیەدا ●



● لە نامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لەبەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ.

● ئەو وتارو نووسینانەی شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، نادرێنەوە بە نووسەرەکانیان.

نرخی «دینارو نیوێکە»

● لەچاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان ـ لە هەولێر چاپکراوە.

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست..

● نووسەرە ئازیزەکان.

● خوێنەرە دڵسۆزەکانی کاروان.

وەکو ئاگادارن گۆڤارەکەتان هەر لەسەرەتای دەرچوونییەوە تاوەکو تەمەنی گەیی بەهەشت ساڵان بەبەردەوامیو بێ پسانەوە مانگانە دەکەوتە بەردەستی ئێوەی ئازیزو، کەلەبەرێکی لە کتێبخانەی کوردیدا دەگرت و دەوڵەمەندتری دەکرد.

کاروان لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا وەکو گۆڤارێکی پتەوو سەرکەوتوو چ لەرووی چروپڕی باس و بابەتەکانییەوە، چ لەڕووی شێوەو ناوەڕۆکدا پێی نابووە قۆناغێکی وا کە زۆربەی زۆری خوێندەوارانی کورد لە نێو وولات و دەرەوەیشیدا لێی بەگلەیی نەبن، تەنانەت هێندێ لە خاوەن کتێبخانەکانی هەندەرانیش پەرۆشەوە داوای ئەوەیان لێ دەکردین کە ببن بەنمایندەی کاروان و هەرمانگەی چەند سەد ژمارەیەکیان بۆ ڕەوانەی دەرەوە بکەین..

ئەوەی ئێمە لەنزیکەوە لێی ئاگادارین بە درێژایی ئەو هەشت ساڵانە دەیەها نامەو داواکاریمان لە خوێندکارو نووسەرانی کوردی عیراق و بەشەکانی دیکەی کوردستان کە لە وولاتانی ئەوروپا سەرگەرمی خوێندنن پێ دەگەیشت و بە گەرمییەوە داوای ژمارەکانی «کاروان»یان لێ کردووین، ئەڵبەتە ئێمەیش وەکو کارمەندانی گۆڤارەکە زۆربەی ئەو داواکارییانەمان پەسند کردوون و هەرچی لە تواناداا بووە کردوومانە، تەنانەت هەوڵی ئەوەشمان داوە ئەرشیفی بەشێکی زۆری کتێبخانەکانی هەندەرانی پێی برازێنینەوە، بەدیاریش چەند دانەیەکی بۆ نووسەرو ئەدیب و مێژوو نووسانی هەندەران بنێرین.

بەڵام بەداخەوە ئەو گوڕو تەوژمەی جاران لەساڵی نۆیەمی تەمەنی گۆڤارەکەماندا وورده وورده بەرەو ساردبوونەوەو کپ بوون دەچوو، ئەوەبوو لەوساڵەدا تەنها «چوار» ژمارەی لێ دەرچوو.

لەساڵی دەیەمیشدا کە دەکاتە ئەمساڵ ژمارە «٩٢»ی دەمێکە دراوەتە چاپخانە؛ بەڵام لەبەر هەندێ گرفت تاکو ئێستا بڵاونەبۆتەوە..

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمەی کارمەندانی گۆڤارەکەتان، چ لەرووی وەفاداری بۆ کاروان و، چ لە ڕووی هەوڵدان بۆ خزمەت کردنی کاروانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیو، هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەو گیان وەبەرخستنەوەی گۆڤاری کاروان وامان بەلاوە پەسند بوو کە هەرچی چۆنێك بێت، بە پاڵپشتی ئێوەی ئازیزیشەوە چەند ژمارەیەکی «کاروان»تان پێشکەش بکەینەوە، بەو هیوایەی کە ئەگەر بۆمان کراو باری هونەریو دارایی گۆڤارەکەمان لەباربوو ئەوە هەم دیسان لە جارانی بەگوڕتر بکەینەوەو پەیتا پەیتا دیدی ئێوەی پێ ڕوون بکەینەوە، ئەگەر خوانەخواستە بۆشمان نەلوا ئەوە دەبێ ئێوەش بمان بەخشن.

بەهەرحاڵ وا ژمارە «٩٣»، ساڵی دەیەمی (کاروان)تان وەکو دیارییەکی بچکۆلانە لەگەڵ نەورۆزی ئەمساڵی کوردستاندا پێشکەش دەکەین و هیوادارین جێگەی ڕەزامەندیتان بێت و لێمانی قەبووڵ بکەن و هەربژین..

کاروان

خزمەتکوزارانی کورد



# لەیـادی ڕۆشنبیری کورد «سالح زەکی بەگی» ساحێبقران دا

**بەرایی**

**داخی بەجەرگم ئێمەی خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی کورد هەتا کو ئێستا کەشی لەگەڵ دابێ ، نرخ و پایەی زاناو داناو روناکبیران و کەڵە نووسەران و پسپۆڕانی خۆمان نازانین ، هەرئەوەندە نەبێ بەپەلەو پایەی بیگانان هەڵدەدەین و ، هەر یەکە لە ئێمە مانانەوە لە پێش هەموو شتێکدا هەڵدەستێ چەندان ناوی قەبەو زلێ زلی گەورەی نووسەرە بیانی یەکان لەزبەر دەکات ، من ناڵێم ئێوە دەربارەی ئەدەبی بیگانان شت نەزانن . بەڵکو بە پێچەوانەوە ، با ئێمە لەسەرەتاوە لە ئەدەبی کوردی خۆمانەوە دەست پێبکەین و بناخەی بۆ دابنێین و ڕێزو پایەو خوشەویستی نووسەرانی خۆمان لەسەرووی هەمووانەوە بێت ، بەتایبەتیش ئەم ڕێزگرتنەیان بگیرێ کە لە ژیاندان ، بەمەیش لەکارو پیشەو پسپۆڕیەکەیاندا زیاتر بەداهێنان و بەبەرهەمتر دەبن . ئینجا دەتوانین لە پاڵ شارەزابوون لە ئەدەبی خۆمانەو ، ڕێزگرتنی ڕۆڵە داهێنەرەکانمانا ، لە ئەدەبی بیگانەوە نزیك ببینەوەو ، ڕۆشنبیری و ئەدەبی کەسێتی خۆمان زیاترو قاڵتر بکەین .**

ئەم چەند دێڕەی سەرەوەم لەبەر ئەوە نووسی چونکە گەلێ لە نووسەرو ڕۆشنبیرو کەڵە شاعیرانان تانەمردن نرخیان نەزانین و ، لە دوای کۆچی دوایی کردنیانەوە ، چلەو یادکردنەوەیان بۆ دەگێڕین ، ئەوەیش پێویستە ، بەڵام خۆزگەو هەزار خۆزگە ، پێش مردن و دوایی مردنیان ئەم ڕێزگرتنەیان بەچاوی خۆیانەو دەدیت !!

لە یادی نەمراندا ، یا لەم خزمەتگوزارانەی کورد کە ئەمڕۆ لە میانەی ئەم وتارەدا یادی دەکەینەوە ، یەکێکە لەو نووسەرو ڕۆشنبیرو ئابووری زانانەی کورد ، خوا

یِ خۆشبوو «ساڵح زەکی بەگی» ئەمرە ، کە لە ١٩٤٤/١٢/١٣ کۆچی دوایی کردووە .

## ساڵی (١٩٤٤)و ڕووداوەکانی بەرامبەر بەنووسەرانی کورد :

ئۆف ساڵی ١٩٤٤ چەند ساڵێکی ڕەش‌بینو ناهەمواربو ، ئاخی «ناری» شاعرمان لە دڵەی دەرنەچو داخی «ع . و . نوری» ئەدیبی هات بەسەرا ، دڵی بێ ئارام ئەوەندەی تو ئاگری تێ بەربوو ، کەچی ئەوەندەمان زانی کونوپڕ خەم و مەینەتی ماڵ‌ئاوایی «ساڵح زەکی» بەگیش بو بەسەرباری ئیتر دڵ‌چون نەبی بەقەقنەس ؟

کوردی بێ‌چارە تووشی دەردێکی واگران بوو کە بە زەحمەت لێی رزگاربی ، ئەویش مردنی صالح زەکی بەگە ، کام ساڵح زەکی ؟

ساڵح زەکی ئەفسەرو ، سەربازی‌زان ، ساڵح زەکی بەرێوەبەرو ، ساڵح زەکی زاناو نوسەر ، ئەو ساڵح زەکی بەگە کە ئەوەتی فامی کردبوەوە تا ڕۆژی کۆچی بەگیانو ماڵ لە پێناوی کوردا هەموو دەمێك تاقە سواری مەیدان بووە ، بە خوراگری و بەرێوەبەرێتی پۆلایینی خۆی لەبەر ئەم هەموو تەنگو چەلەمەی زەمانەدا ڕاگرت‌و نەیهێشت کەسیش بەدەردی بزانی ، ئەو بە ئێمەی زانی داخی بەرگم ئێمە بەومان نەزانی تا لە دەستمان دەرچوو ، ئەوەندە هەیە ئەو خوی ڕۆیی بەڵام قەدری (ڕێزی) نەرۆیی ، چونکە بێجگە لە خزمەتەکانی تری لە پێناوی کوردا ، «دیاری کوردستان»ی لە دیاری کوردستانا بانگی دیاربوونی ساڵح زەکی بەگ ئەکا[1] .

## ژیانی خوالی خۆشبوو «ساڵح زەکی بەگی صاحێبقران»

کوری حوسێن بەگ کوری داود بەگ کوری مەحموود بەگی صاحیبقرانە ، لە مارتی ١٨٨٦ی ز ، لە شاری «هەڵەبجە» هاتوەتە دنیاوە ، لە ١٨٩٤دا دایکی مردووە . ساڵێك پاش ئەوە باوکیشی ڕێی حەق گرتوە ، حاجی عثمان بەگی مامی دەستی کێشا بەسەریاو بردیەلای خۆی لە سلێمانی ، لە هەمان ساڵی ١٨٩٤دا لە سلێمانی چوە قوتابخانەی روشدیە ، لە ساڵی ١٨٩٩ دا قوتابخانەی سەرەتایی لە سلێمانی کۆتایی پێ هێناوە وەبۆ تەواوکردنی خوێندنی چوتە بەغداو لەوێ چوتە ئامادەیی سەربازی‌یەوە ، لە ١٩٠٢دا ئەو قوتابخانەیەشی تەواو کردوە ، لەپاش گەلێ پارانەوەو تکا کردن لەمامو خزمەکانی توانیویە بیانهێنیتە سەر ئەوە کە بیچێتە «ئەستەمبول» بخوێنێت ، هەتا بەسەر مەرامەکەیدا سەرکەوت‌و چوە ئەستەمبول‌و لەوێ چوە «قوتابخانەی جەنگەوە» ، لە ١٩٠٦ بە ئەفسەری دووەم لە قوتابخانە دەرچوە ، لە ١٩٠٧ چوەتە فەیلەقی شەشەمی لە عێراقدا .

لە کاتێکا کە بەرێوەبەری هۆبەی مامەڵاتی خۆیەتی تیپ بوو مدیری شعبەی معاملاتی ذاتیەی فرقە) بووە .

هاوبەشی شەڕی گەورەشی لەبەرەی عێراقدا کردووە ، لە کاتێکا کە یاوەری «عەلی‌بەگ» بوە لە شەڕی «شعیبە»دا برینێکیان لە شانی چەپی کردووە ، هەروەها لە ئوردوی عثمانلی‌دا ماوەتەوەو سەرکەوتوە هەتا بوە بە «بین باشی» ، لە ساڵی ١٩٢١ دا فەرمانبەرێتی بەجێ هێشتوەوە لە «دیاربەکر»ەوە گەراوەتەوە بۆ عێراق‌و ، لە ساڵی ١٩٢٢دا لەلایەن میری عێراقەوە کرا بە قائمقامی «ئاکرێ» بەڵام پاش ماوەیەکی کەم فەرمانبەرێتی دایە دواوەو چوەوە بۆ (سلێمانی) لەوێ خۆی گەیاندە شۆرشی کورد لەگەڵ «شێخ مەحمود» وەبو بە وەزیری جەنگی کوردستان ، لە ساڵی ١٩٢٤دا لەلایەن میری‌عێراقەوە ناچار کرا بگەرێتەوە بۆ بەغداو ، بی بە خانەشاری ئەوی ، لە ساڵی ١٩٢٥دا بە سێ زمان کوردی ، تورکی ، عارەبی گۆڤاری «دیاری کوردستانی» دەرهێنا ، لە ١٩٢٦دا کرا بەمدیری ناحیەی (مەڵبەنداری قرانیە) لە پاش شەش مانگ بەهەمان پایە گوزرایەوە بۆ (شارەبان) ماوەیەکی کەم کە شارەبان کرا بە قەزا کرابە قائمقامی ئەوێ .

لە پاشان گوزرایەوە بۆ قەزای «عفك» و لەوێشەوە بۆ «چەمچەماڵ» . لە ساڵی ١٩٣١دا کرا بە یاریدەدەری یەکەمی بەرێوەبەری ناوەخۆی عێراق . لە ١٩٣٣دا کە فەرمانبەرێتی یەکەیان هەلگرت کردیان بە قائمقامی «کویسنجق»و ناردیان بۆ ئەوێ ، ١٩٣٤دا بە هەمان پایە نێررا بۆ «ئامێدی» . پاش شەش مانگ لە ئەیاری ١٩٣٥دا کرا بە متصرف سلێمانی ، لەپاش ساڵێك‌و هەشت مانگ گوزرایەوە بۆ (دیالە) لە ١٩٣٧ دا کرابەسەرۆکی تەسویە لە (کەرکوك) لەوێشەوە بە هەمان پایەی فەرمانبەرێتی بۆ (مۆسل) لە مۆسلەوە بۆ تەسویەی (اعظمە) لە بەغدا ، لەوێوە بۆ (کوت) لە ١٩٣٨ بۆ تەسویەی (دیوانیە) لە ١٩٣٩ لە فەرمانبەرێتی هەلگیرا ، لە پاش دوو مانگ کرا بە متصرف (هەولێر» لە مایسی ١٩٤٠ بە بەخانەنشینی دەستی لە کارکردن کێشرایەوە . لە پایزی ١٩٤٢دا کرا بەپشکێنەری بەرێوەبردن «مفتیش اداري» لە بەغدا . لەم ئیشەدا مایەوە تا لە ١٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٤ی ز کۆچی دوایی کردو لە گۆرستانی (ئەعظەمیە) لەبەغدا زۆر بەرێزەوە نێژرا[2] .

## ساڵح زەکی بەگی بەرێوەبەرو رۆشنبیر

ئەم ساڵح زەکی بەگەی کە باسکرا ، ساڵح زەکی یەکی بەرێوەبەر بوو ، بەڵام ئەگەر لاپەرەی مێژوو هەلیگێرینەوە ساڵح زەکی بەگێکی زانا ، نووسەر نیشتمان دۆست‌و هۆزانڤان بەرچاو ئەکەوێت بێجگە لە پیاوەکەی پێشو ، خاوەنی وەرگێران هەرچەندە پاشماوەی چاپکراوی زانستی زۆر بەرچاو ناکەوێت بەڵام لە کاتێکا کەبهاتابایەتە قسە کردن ئەوکاتە دەرئەکەوت کە تاچەپلەیەك لە هەموو لایەنێکی زانستی بەوە بەشی وەرگرتوە ، لەسەر ئەو هەموو مەینەتی‌و ناهەمواریەدا ، کە بەسەری هاتبو هەموو دەمێك ژیانی خوێندنەوەو قسەکردن لە بارەی زانستی‌یەوە بەلایەوە لە هەموو ژیانێك خوشترو بەنرختربووە . بەتایبەتی لە زانستی مێژووو ، سەرگوزەشتی رابوردواندا دەستێکی باڵای هەبوە .

ئەگەر یەکێ بیەوێ سالح زەکی ئەدیب بناسێت بەسە بۆ تێگەیشتنی ئەوو ئەدیبی سالح زەکی بەگ سەیرکردنی «دیاری کوردستان»ی بەشێوازی نەخشین و ڕەنگینی سێ زمان ، کوردی ، تورکی و ، عارەبی ئەزانری کە تا چەند پایەیەك خاوەنی وەرگێرانی ئەدەبیات و پایەی خوشەویستی ئەدبیاتا دەستی بوە ، وە چ ڕەنجێکی لە پێناوی ئەدەبیات - بەتایبەتی - کوردیدا کێشاوە ، بێجگە لەمانە بە عباراتی پرماناو نکاتی نرخداری هەموو دەمێك دانیشتوانی ئەنجومەنی خوی سەرسام کردووە .

خاوەنی وەرگێرانی لەقسە کردنی عارەبی ، تورکی ، فارسی و فەرەنسی‌دا هەموو دەمێك بە کوڕی ئەو زەمانانە ناسراوە ، لە پایەی شاعیریشدا بنەماڵەی ساحێبقرانی بەبۆشی نەهێشتوەتەوە . کام بنەماڵە ؟ . . ئەو بنەماڵەیە ئەگەر بوتری ئارەزووی شیعروو بیری تیژو بەرز لە مەیدانی شاعیریەتیدا لە پاشە روکی ئەوانە هیچ دوورنی بەو دوورنی یە .

گیانی نیشتی پەروەری سالح زەکی بەگ ئەو گیانە بو ، کە بستی واشۆرشی کورد . لە کوردستانا دەست پێ‌کراوە ژیانی خوی و ژیانی فەرمانبەریتی هەموو خستەلاوە بۆ ئەوە ئەویش وەکو بەرزترین کورد بە ئاواتی خوی بگا ، ئەوسانەی بەلاوە خوشبەختی بو کە زورتر هیلاك (ماندو) بیوایە بەشوێن ئیش وکاری کورد بکا کە ڕوی لێ بنایە کە لێشیان بپرسیایە بۆچی وا ئەکەی ؟ ئەیووت : «خۆ بۆ ئەوی ناکەم ، بۆ خۆمی ئەکەم» ئەم قسەیە وامان پێشان ئەدا کە گیانی هەموو کوردێکی بەگیانی خوی زانیوە .

لە قسەکردنا زور هێمن و لەسەر خۆبوو ، تابیری لەقسە نەکردایەوە نەی دەکرد . پیاوێکی هەتا بلێت چاوتێرو دڵفراوان و بەنان خوان بوە ، بەڵام هەتا ئەو ڕۆژی سەری نایەوە هیچ ساتێك نەبو کە بەختی لەگەڵیا ڕێکەوێت[3] .

## شینی سالح زەکی بەگ

سلێمانی : رمزی وهبی

له بیشەی زندەگانی و هستیا شێری ژیانم رۆ
لەباغی راستی و سەربەرزیا سەروی رەوانم رۆ
له بورجی کوردەواری و لەوجی دانایی و سیاستدا
مەهی مهرو وەفا شەهبازی عرفان اشیانم رۆ
له دورجی خانەدانی و فوجی قیمەتداری کوردیدا
دوری صاحیقران ، سەرکردەی گەورەو گرانم رۆ
له کۆڕی شینا داکی وطن هاواری بۆ لەیوت
کزەی دڵ ، هێزی لەژنۆ ، نوری هەردوو دیدەکانم ڕۆ
دەبیری با خبراستادی دانایانی دانشوەر
ئەدیبی پر هونەر علامەی معجز بیانم رو

لەبو غونچەی گوڵی سالی وفاتی «رمزیا» دوینی
سەرم کیشایە باغی ابجدی و وانم فلانم رۆ
له سەرشاخی گوڵی دیم بولبولی ئەم مصرعەی فەرمو
«له(٠) گلشندا گل صالح زکی صاحێترانم رۆ»[1] ١٣٦٤ کۆچی

## شین بۆ صالح زکی بەگ

کەرکوك : لەلیری

نەبو لەی پیاوی چاك چاخی نەمانت
بۆ گەل لەم چەرخە پێویست بو ژیانت
لە داخی گەل زوانم بەسترابو
لە داخی تو کراوە بو بیانت
لە داخی کۆچی تو ، دڵبو بەسوتو
ئەگەرچی بو بەهەشتە ڕێی ڕەوانت
کە جێ‌تیشتن و الجالێت گەیشتین
چلون بو بوگەڵت هەمولو دەوانت
پیاوی لەشکری و زاناو هوشمەنگ
کەلێنی خستە قولەی گەل ، نەمانت
لەشت گەرچی نەما گوم بو لەبەرچاو
دەمێنی تاکو کورد مای نیشانت
گەواهی و بەڵگەی گەورە بوزرگیت
لەدوی خوت جی نەما ماڵ و مالت
بەمە زور بەرزلەرو بالاو بولند بویت
هەتا لەوجی فەلك چو ناو و نیشانت
دەلی ئەو دەولەتەی جی ما لە پاڵت
بەسە لەو ناوی چاکە بو بەهالت
نەبو کورتیت لە کاری چاکە بۆ گەلو
نەشتکرد هیچ دوهمی ناو و خوانت
«لە غەفرت ، هالە دەر تاریخی چونت
لە بو باغی بەهەشت جی گیرومانت[5]

سەرچاوەکانی ئەم باسە :
(١) گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە ، سالی (٦) کانونی دووەم . ١٩٤٥ . ل : ٥٢
(٢) گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە (٣) ، سالی (٦) ئادار . ١٩٤٥ . ل : ٢ . ٣
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل : ٣ . ٤
(٤) گەلاوێژ ، ژمارە (٢) ، سالی (٦) ، شوبات . ١٩٤٥ . ل : ٤٣
(٥) گەلاوێژ . ژمارە (٤) ، سالی (٦) ، نیسان . ١٩٤٥ . ل : ٤٠ . ل

عومەر ئیبراهیم پەتی

# زانینی زمان

عبد الخالق احمد عزیز

شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەر نەتەوەیێ بە زمانی نەتەوەیی خۆی دەدوێ . بەرلەوەی بچینە ناو باسەکەمان پێویستە چاوێك بەو بیروراو بیردۆزانە دابگرین کە تایبەتە بە گەشەکردنی زمان . دکتۆر (حسین الحاج حسن) لە کتێبی (علم الاجتماع الادبي)دا چوار بۆچوونی دەست نیشان کردووە[1] . بە کورتی ئەمانەن :

١ – بیردۆزی یەکەم : ئەو کەسانەی کە سەر بەم کۆمەڵەن لەو باوەڕەدان کە گەشەکردنی زمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سروشە خوایی یەی (الهام الهي) کە بۆ مرۆڤ هاتووە فێری قسەو ناوی شتی کردووە .

٢ – بیردۆزی دووەم : ئەم کومەڵە لەو باوەڕەدان کە زمان داهێنراوێکی تازەیە پەیوەندی بەرێك‌کەوتن‌و گونجانەوە هەیە .

٣ – بیردۆزی سێیەم : ئەم کومەڵە لەو باوەڕەدان کە گەشەی زمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ویست‌و ئارەزووە تایبەتی یە کە لە هەموو مرۆڤێکاکەوە هەیە . ویست‌و ئارەزووە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ ئەوەی بەچەند کارو رەفتارێ هەڵبستێ .

٤ – بیردۆزی چوارەم : ئەم بەدۆزە هۆی گەشەو سەرهەڵدانی زمان بۆ دەنگەکانی سروشت‌و دەنگی گیانەوەران دەگەڕێنێتەوە . لێرەدا دەتوانین بڵێین کە پەرەسەندنی زمان دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤ خۆی‌و ژیانی کومەلایەتی ، کە زمان بۆ دەربڕینی هەستی خۆی بەکار دەهێنێ . زمان سیفەتێکە لەو سیفەتە بنچینەییانەی کە مرۆڤ لە گیانەوەر جیادەکاتەوە لەگەڵ ئەوەشا نەئوم چۆمسکی چەند سیفەتیکی هاوبەشی لەنیوان مرۆڤ و گیانەوەر دەس نیشان کردووە .

زمانی مرۆڤ‌و زمانەکانی گیانەوەران مەرامی‌و پێکهاتوو بەیانی‌یە (قصدیە ترکیبیە وبیانیە) زمان مەرامی‌یە چونکە ئامانجی قسەیە بە شێوەیەکی گشتی بریتی‌یە لە گواستنەوەی شتێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی‌دی وە گۆڕینی ڕەوشت‌و بیری لە هەڵوێستێکەوە بۆ بارێکی دیاری کراو وە زمانی مروڤ پیکهاتوویی‌یە چونکە هەر ئاخاوتنێ خاوەنی ڕژێکی تایبەتی ناوخۆیی‌یەو بناغەیەکی بەیەکتر بەستراو دیاری کراوی هەیە . وە بەیانی‌یە (ڕاگەیێنەرە) چونکە زانیاری دەگوازێتەوە[2] .) .

کەوایێ گیانەوەران لەنێوان خۆیان بەدەنگی تایبەتی ڕازو نیازی خۆیان دەردەبڕن ، کە هەر دەنگێ مانای تایبەتی خۆی دەبەخشێ . بۆ نموونە بۆق لە وەرزی زاوزێ‌دا بە دەنگێ دەخوێنێ تاوەکو (نێرومێ) لیك نزیك‌دەبنەوە بۆ مەبەستی زۆربوون . وەمریشکی جووجەڵەدار وورتە دووتە .

توانای مرۆڤێ لە زمان ، واتە قسەکردن ، لەگەڵ مرۆڤێکی تر هیچ کەم‌و کوڕی نی‌یە ، گەر توشی نەخۆشی دەماری نەبێ . وەیا کەڕولاڵ نەبن . هەرچەندە کەڕولاڵ زمانێ بۆ دەربڕینی هەستی خۆیان بەکار دەهێنن لەویش زمانی ئیشارەتە .

زانینی زمان ، واتە زانینی بەکارهێنانی زمانێ ، جا گەر زمانی دایك (نەتەوەیی) بێ یا بێگانە بێ خاسیەتێکی مرۆڤایەتی‌یە هەموو مرۆڤ ، بێ جیاوازی لە رەنگ‌و رەگەز وەیا گەورەیی وبچوکی نەتەوە ، دەگرێتەوە .

قوناغی فێربوونی زمانی دایك ، لە ساڵی دووەمی تەمەنی منالی دەست پێ دەکا . لەم قۆناغەدا منال هەندێ دەنگ‌و ووشە دەردەبڕێ . وە لە دوایی دوو ساڵ‌دا وە یا سێ ساڵ‌دا منال توانای ئەوەی دەبێ کە زمانی دایك بەکاربێنێ وەگۆی گریش بەسانای بێ ئەوەی تووشی هیچ سەر ئێشەیی‌ی بکا لە مەبەستی منالێ دەگا . ئەم رووکارە ئەوە دەسەلمێنێ کە زانینی زمان لە ئەنجامی ئەزبەرکردنی کۆمەلە رستەیێ وەیا چەند دەربڕینی‌کەوە نی‌یە کە لە ژیانی ڕۆژانەی پێویستی پی‌ی هەیە . زیادکردنی توانای زمانی (القدرة اللغوية) بۆ زمانی دایك بەوەوە نی‌یە کە دایك و باوك منالەکانیان فێری هەندێ دەربڕین و دەستەواژە بکەن . بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەیە کە منالێ وەیا هەر مرۆڤ فێری زمانی دایك دەبێ فێری ڕێساو ڕێزمانی زمانی دایك ناکرێ ، بە شێوەی دەرسی ڕێك‌وپێکی سازکراو نابخوێنێ ئەمەش بە تەواوی بە پێچەوانەی فێربوونی زمانی بیانی‌یە کە لە سەرەتای فێربوونەوە فێری ڕێساکانی زمانە بیانی‌یەکە دەکرێ .

ئەو زانینەی مەبەستمانە پەیوەندی بە دەنگ وەیا شێوەی پێك‌هاتنی دەنگی زمانەوە نی‌یە . چونکە مەسەلەی پەیوەندی نێوان ووشەکان مانای ووشەکان شتێکی خۆرسکە . وە هەندێ جار پەیوەندی بە سروشتەوە هەیە . ئەم پەیوەندی‌یە خاسیەتە ، لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی ترەوە جیاوازی هەیە . ئەگەر ئەم جیاوازی‌یە نەبوایە ئەم کەلێنە گەورەیە لە ماناو ووشەکانی نێوان زمانەکان پەیدا نەدەبوو . لە هەر زمانێ پەیوەندی نێوان دەنگەکان دەبێتە هۆی دروست کردنی ووشەی مانا دار . هەرچەندە لە زۆربەی زمانەکان‌دا هەندێ ووشە هەن راستەوخۆ پەیوەندیان بە سروشتەوە هەیە . بۆ نموونە چەند نموونەیێ لە زمانی کوردی‌دا لێرەوە باس دەکەین

خشە (خشەخش) : لە ئەنجامی راکێشانی شتێ لەسەر زەوی دەنگێ پەیدا دەبێ لەم ووشە یە نزیکە

خەو : لەو دەنگەوە هاتووە کە مرۆڤ لەکاتی خەوتن دەری دەکا .

گڤە : ئەو دەنگەیە کە لە ئەنجامی هەڵکردنی با پەیدا دەبێ

کوکوختی : بەو بالندە دەووترێ کە لە کاتی خویندن‌دا دەنگی دەردەکا لەم ووشەیە نزیکە . وە لە زمانی ئینگلیزیش پی‌ی دەووترێ Cuckoo

گرمە : ئەو دەنگە لە ئەنجامی تەقینەوەی بۆمبا وەیا شتی‌تر پەیدا دەبێ

تف : لە کاتی تف ڕووکردن دەنگێ پەیدا دەبێ لەم ووشەیە دەچێ جگە لەوەش زۆربەی گیانەوەرەکان بە زمانی منالێ بە دەنگەکەی دەناسرێ . بۆ نموونە :

میاو (پشیله) له میاوه میاوه کردن
بەعە (واتە مەڕ یا بەرخ)
عەو عەو : (سەگ)

ئەم جۆرە ووشانە بە بەراووردکردنیان لەگەڵ روشەکانی هەر زمانێ ناگەنە پەنجەکانی دەست .

زانینی زمان لە چۆنیەتی بەیەکەوە بەستنی ووشە بۆ دروست کردنی رستە دەکوڵێتەوە . ئەم بەیەك بەستنەوەیە لە ئەنجامی زانینی قسەکەرەوەیە کە پەیوەندی‌یەکی راستەو خۆی لەگەڵ زمانەکەی خۆی هەیە ، کە لە ئەنجامی بەیەك بەستنەوەی ووشە رستە پێك‌دێ کە گوێگر لێ‌ی تێ‌دەکا ، وە گوێگر بە دەووری خۆی بەپێ‌ی ئاستی شی‌کردنەوەو تێ‌گەیشتنی وەلامێ بۆ پرسیاری قسەکەر ئامادەدەکاو وەلامی دەداتەوە .

ژمارەی رستەکانێ هەر زمانێ ، لە ژمارە نایێ هەر لەبەر ئەمەشە فەرهەنگێکی تایبەت بەو رستانە نی‌یە کە نەتەوە بەکار یان دێنێ ، بەلام هەموو زمانێ فەرهەنگی خۆی هەیە کە گشت ووشەکانی زمانی ئەو نەتەوەی تیایە ، کەوابێ ووشەکانی هەر زمانێ سنووردارە ، واتە ژمارەیەکی دیاری کراوی دەبێ ، هەرچەندە تاوناتاوێ لەگەڵ گەشەکردنی زانستو تەکنۆلۆژیا ووشەو زاراوەی زانستی خۆی ئەخاتە نێو زمانێ زۆربەی نەتەوەکان . بەلأم رستەکانی زمان لە ژمارە نایێ ، چونکە رستەی سیفەتێکی لاستیکی‌هەیە واتە توانای کشانو گڕ بوونی هەیە واتە دەتوانرێ زۆر درێژ بکرێ وە دەتوانرێ زۆر کوت بکرێتەوە بە رادەیێ هەندێ جار دەگاتە تاقە ووشەیێ .

بۆ نموونە :
أ - ١ - ئەو دزەم بینی کە پارەی دزی
٢ - ئەو دزەم بینی کە پارەی پیاوەپیرەکەی دزی
٣ - ئەو دزەم بینی کە پارەی پیاوە پیرە دوکاندارەکەی دزی
٤ - ئەم دزەم بینی کە پارەی پیاوە پیرە دوکاندارەکەی بەرامبەر مزگەوتێ‌ی دزی .
ب - ١ - ئازاد بۆ کوێ چوو ؟
بۆ بەغدا . (واتە . ئازاد بۆ بەغدا چوو)
٢ - ئایا هیوا قوتابی‌یەکی زیرەکە ؟
بەڵی (واتە بەڵێ هیوا قوتابی‌یەکی زیرەکە)
٣ - چووی بۆ قوتابخانە ؟

نەخیر (واتە نەخیر نەچووم بو قوتابخانە)

لەم نموونانەی سەرەو بۆمان دەردەکەوێ کە دەتوانرێ رستەی زۆر بچوك دروست بکەین ، وە رستەی زۆر درێژ بچوك بکەینەوە وەیا بە شێوەیەکی کورت وەلامی پرسیار بدەینەوە کە هەمان مانا ببەخشێ . ئەم درێژکردنەوەیە پێ‌ی دەووترێ تێك‌هەلکێشان . ئەمەش سیفەتێکی زمانە . هەرچەندە درێژکردنەوەی رستە شتێکی ناپەسندە ، چونکە گوێگر ناتوانێ تەرکیز لەسەر رستە بکا ، بەلأم لە رووی نەزەری‌یەوە درێژکردنەوە هیچ زیانێکی نی‌یە .

لە ژمارە نەهاتنی رستەو درێژی‌و کورتی رستەکان گرینگترین خاڵی یەکترگرتنەوەن لەلایەن ئەو کەسانەی لە زانینی زمان دەکوڵنەوە . توانای زانینی زمانی وا لە مرۆڤ دەکا ئەو رستەو دەستەواژە نوێ‌یانە تێ‌بگا کە لەمەوبەر بەری گوێ‌ی نەکەوتووە . وەیەکێ لەو جۆرە رستانە ئەو رستانەن کە خوێنەر لە کتێبێکی تازە بەردەست کەوتوو دەیخوێنێتەوە ، وە زۆربەی زۆری ئەو رستانەی لەم کتێبە تازەیە بەرچاوی دەکەوێ ، لە کتێبی تر بەرچاوی نەکەوتووە یا لە کەسێ‌تری نەبیستووە بەلأم رەنگە بە هەمان دەربڕین وەیا مانا گوێ لێ بووبێ بەلأم بە هەمان دارشتن‌و ووشەوە نەبیستووە . لەسەر ئەم بناغەیە دەتوانرێ زانینی زمان لێکولینەوەی لەسەر بکرێ . بیورای ئەم دەستەیەی کە چۆنیەتی دروست بوونی رستەو درێژی‌و کورتی بە بناغەی لێکۆڵینەوەیان دادەنێن بە تەواوەتی دژی دەستەی بۆچوونی زانایە رەوشتی‌یەکانە ، چونکە رەوشتی‌یەکان دەڵێن زانستی زمان لەسەرپرس‌کردن‌و کاردانەوەو ریکخستنەوە وەستاوە . بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو رستانەیە کە ئێمە لە هەندێ کاروباری تایبەتی‌دا بەکار یان دەهێنین . بۆ نموونە ئەو رستانەی لە هەواڵ پرسین‌و چاك‌و چۆنی‌دا بەکار دەهێنرێن لە چەند رستەیێ تێ‌پەرناکەن ، لە ماناوەش لە یەکەوە نزیکن ، هەموو ڕۆژێ دووبارە دەکرێنەوە .
- چۆنی ؟
- تۆ چۆنی ؟
- تەندروستیت چۆنە ؟
- زۆر باشی ؟
شوکر ساغ‌و سەلامەتی ؟

بەلأم رستەی‌تر کە لە هەڵسوکەوت‌و مامەلەی ژیانی رۆژانە بەر گوێیان دەکەوێ وەیا دەری دەبڕین بەدەگمەن وارێك دەکەوێ کە گوێیان لێ‌ی بووبێ وە یا دووبارەکرابێتەوە . ئەمەش سەرنجمان بۆ توانای زانینی زمان لای منال رادەکێشێ ، کە پاش تەمەنی دوو سالی یا زیاتر دەست پێ‌دەکا ، کاتێ کە توانای ئەمەی دەبێ بەپێ‌ی ئاستی زانینی‌و بەپێ‌ی توانای هەڵێنجانی ووشە لە مێشکی‌دا جێگر دەبێ لەم حالەتەدا توانای ئەوەی دەبێ کە رستەی تازەو گونجاو ، بەپێ‌ی ئەوەی لە مێشکی جێگیربووە ، بدرکێنێ ئەم توانایەش لە توانای کەسێکی بالغ بووی کەمترنی‌یە ، چونکە پیاوی بالغ بووش هەروەکو ئەو بە گوێرەی تێ‌گەیشتنی خۆی وەلامی پرسیار دەداتەوەو دەستەواژەی پێویست دەدرکێنێ . ئەمەش وامان لێ‌دەکا کە بڵێن کە مرۆڤ لە دایك دەبێ خۆی لاوەکی‌یانە شەیدای فێربوونی زمانە واتە توانای فێربوونی زمان لەگەڵ لە دایك بوونی مرۆڤ وەکو لایەنێکی گەشەکردنی ئەندامەکانی تری لەش گەشەدەکا بۆیە لایەنی پێك‌هاتنی زانینی زمان ، واتە تایبەتمەندی‌یەکانی دروست بوونی دەنگ‌و بنەماکانی تری زمان ، وەکو لایەنێکی گرنیگی زانینی زمان دەمێنێ و دەبێ بە بەشێك لە زانستی دەروونی هۆش دابنرێ وە جۆمسکی لەم بارەوە ووتوویەتی کە زانینی زمان ژمارەیەکی زۆر و لەبن نەهاتووی رستە دەگرێتە خۆی ئەو رستانەی کە زمانیان لێ‌پێك دێ . زانینی زمان ئەو زنجیرە پەیڤە زمانیانە (مفردات) دەگرێتەوە کە دەکرێ ناوی رستەیان بۆ دابنێین . هەموو کۆمەلە ووشەیێ رستە نی‌یە وەحوکمی جیاجیا بەسەر ئەو زنجیرە ووشە یەکگرتوانە دادەچەسپێنین سەرەرای ئەوەش مانای

ئەو پەیڤانە ، بەگوێرەی شوێنیان لەناو رستەکەدا دەزانین . وە شوێنی ئەم پەیڤانە راستو دروستی رستە دەردەخەن (ئاستی زانینی زمان وامان لێ دەکا کە بڕیار لەسەر راستو چەوتی ڕستەکان بدەین) .

| ڕستە | جۆری راڤەکردنی هۆیەکەی |
| --- | --- |
| ١ ئازاد چوو بۆ قوتابخانەراستە | رستەیەکی رێزمانی تەواوە |
| ٢ – قوتابخانە ئازاد چوو بۆهەڵەیە | رستەیەکی نارێزمانی فرمانو بکەرو ئامرازی بەستنەوەش لە شوێنی گونجاوی خویان نین |
| ٣ – قوتابخانە چوو بۆ ئازادهەڵەیە | بکەر لە شوێنی خوی بەکار نەهاتووە ، لە شوێنی ئەو قوتابخانە داندراوە . |
| ٤ – پێلاوێکی ئاسم کڕیهەڵەیە | رستەیەکی رێزمانی‌یە بەلاّم لۆژیکی نی‌یە |
| ٥ – گەورە تەلەفزیۆنێکم کڕی هەڵەیە | رستەیە ناتەواوە چونکە ئاوەڵناو لە پێش ناوەوە هاتووە |
| ٦ – کورسی یەکە لەسەر هەڵەیە مناڵەکە دانیشتوە . | بەرکار لە سەرەتای رستەکەوە هاتووە . لەگەل بکەر (مناڵەکە) جێگۆرکراوە وە لۆژیکی نی‌یە |
| ٧ – شیرین کوڕە هەڵەیە قارەمانێکی کوردە | رستەیەکی رێزمانی تەواوە بەلاّم لۆژیکی نی‌یە چونکە شیرین کچە کوڕ نی‌یە . |

**شوێن و کات دەوورییان لە زانینی زمانو تێگەیشتنی ڕستەدا :**

لەسەرەوە بۆمان روونبووەوە کە توانای زانینی زمان دەووری سەرەکی لە تێگەیشتنی ڕستەو جیاکردنەوەی راستو چەوت هەیە . بەلاّم شوێنو کات دەووری تایبەتی خۆی لە تێگەیشتنی رستەدا هەیە لەوانەیە پایەکەی لە پایەی توانای زانینی زمان کەمتر نەبێ . چونکە شوێن وکات دەووری سروشت لەم دەووروبەرە دەبینن کە بۆیە جاری وا هەیە بە ووشەیێ دەتوانین مەبەستێکی تایبەت دەرببڕین کە لە جیاتی رستەیەکی تەواوەیە بۆ نموونە :

أ – کاتێ لە چێشتخانەیێ دادەنیشین بۆ ئەوەی جەمێ نان بخۆین کاتێ شاگردی چێشتخانە بە لامان ڕەت دەبێ ، پێ‌ی بلێین (ئاو) ئەو یەکسەر دەزانێ کە پێویستمان بە ئاو هەیەو ئاومان بۆ دێنێ لێرەدا ووشەی (ئاو) کە تاقە ووشەیەکە لە جیاتی رستەی (تکایە هەندێ ئاو بێنە) یە .

ب – بەلاّم کاتێ بە ناوچەیەکی شاخاوی پڕ لە دارستان لەگەل هاوڕێ‌کانت بە پیادە یا بە سواری دەسووڕێنەوە کاتێ ووشەی (ئاو) دەدرکێنی ، بێ سێ‌و دوو سەرنجی هاوڕێ‌کانت بۆ لەوە رابکێشی کە چاوت بە دیمەنێکی قەشەنگی ئاو کەوتووە ، وە یا کانیاوێکت بینیوە لەتەوێ نیشانی ئەوانی بدەی . لێرەدا دەتوانین ووشەی ئاو لە جیاتی رستەیەکی سەرنج راکێش بێ وەکو لەم ڕستەیە :

(سەیری ئەم ئاوە بکەن لە ژێر ئەم بەردەوە هەڵدە قوڵێ) .

جـ – کاتێ بە سواری ئۆتومبیل لە ناو شاردا دەسووڕێنەوە گەر بڵێ‌ی (ئاو) ووشەی ئاو لێرەدا هیچ مانایەکی وای نابێ سەرنجی هاوڕێ‌کانت رابکێشێ وە لەوانەشە هەر هاوڕێ‌یێ بە مانایی لێت تێ‌بگا وە لەوانەشە بلێن .

(ئاوی چی ؟) ، (کوا ئاو ؟) ، (چی‌یە خەونت بینووە ؟) جا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە شوێن‌وکات شوێنی تایبەتی خۆی لە تێگەیشتنی رستەدا دەبینێ .

وەهەندێ جار هەندێ دەستەواژە وەیا ئیدیەم هەن لە رستەدا بەدیار دەکەون . ئەم دەستەواژانە پێویستە بە شێوەیەکی رێك‌و گونجاو بەکار بهێنرێن ، چونکە بەکارهێنانیان بە شێوەی گونجاو وەیا چەسپاو لە لە زمانی نەتەوەی‌دا دەبێتە هۆی ئاسانکردنی تێگەیشتنی رستەکە بۆ نموونە :

١ – (بژی برایەتی کوردو عەرەب) لە (بژی برایەتی عەرەب‌و کورد) سوێرك ترە لەسەر زمان وە بە پێچەوانەوە لە زمانی عەرەبی (عاشت الاخوة العربية والكردية) سووك ترە لە (عاشت الاخوة الكردية والعربية) .

٢ – (زەردو سوور) سووك‌ترو باوترە لە (سوور و زەرد)

٣ – (ڕەش‌و سپی) سووك‌ترو باوترە لە (سپی‌و ڕەش)

٤ – (دارو بەرد) سووك‌ترو باوترە لە (بەردو دار)

ئەم جۆرە دەربڕینە پێ‌ی دەووترێ وەزیفەی شعری (الوظيفة الشعرية)

بە کورتی دەتوانین باسەکەمان لەم چەند خاڵە کۆبکەینەوەو پوختەکەی بنووسین .

١ – ژمارەی رستەکانی زمانی هەر نەتەوەیێ لە ژمارە نایێ . ئەمەش بە هۆی تێك هەلکێشانی رستەیێ لە رستەیەکی ترەوە

٢ – بەکارهێنانی زمانی رۆژانە شتێکی ئاسایی‌یە (عادی‌یە) و نوژەنە واتە بەشی زۆری ئەوەی دەیلێین تازەیەو دووبارەکردنەوەی کەمە .

٣ – یەکگرتنی (تماسك) زمانو گونجانی لەگەل دەووروبەری رستەی دەربڕاو کارێکی گرنگ دەکاتە سەر گوێ‌گر .

٤ – زمانو ریکخستنی ووشەی دانانی ووشە لە شوێنی گونجاو بڕیار لە راستو دروستی ڕستەکە دەدا ، بەهایەکی تایبەت بەرستەکە دەبەخشێ .

---

ژێدەر : ١ – بۆ سوود وەرگرتن سەیری کتێبی :

١ – (علم الاجتماع الادبي) الدكتور حسين الحاج حسن ط ١ ص ١٦٣ بکە .

٢ – الالسنیە (علم اللغة الحديث) د . میشال زکریا ص ٢٩ وەهەروەها بۆ نووسی ئەم باسە سوودم لە کتێبی An Introduction to Language by Victoria Fromkin and Robert Rodman m;c£cjmm;

O

د. مارف خەزنەدار

لەلاپەڕەکانی «مێژووی ئەدەبی کوردی»:

# سەرەتاکانی ئەدەبی کوردی ڕوخسار و ناوەڕۆك

ئەدەبی کێیی درەختێکی یەکجار گەورە و قەف ئەستوورە ، لق زۆر بلند بۆتەوە بەرەو ئاسمان ، دەماری بنەوی خووار بۆتەوە ناخی زەوی و پەلی هاوێشتووە بۆ هەموو لایێك و گەیشتۆتە سەر چاوەی هەموو ئاوێك ، لق و پۆپی کۆن و تازە تێکەڵ بە یەکتر بووە . بێ گومان ئەدەبی کوردی وەکو داهێنانێکی نەتەوەیی یەکێکە لە سە هەرە گرنگەکانی ئەم درەختە لە کۆنی کۆنەوە تا ئێستا .

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ، لە بەهارێکی تەڕ و جووان ، تووله لە چرۆێکی ئەو درەختە پشکووت ، ئەو تووله ئەمامە بە درێژایی ڕۆژگار بوو بە لقێك لە ئەدەبی ئەو زمانەی ئێستا کە نەتەوەی کورد قسەی پێ دەکا ، بەرهەم وبەری کەوتە ناوەوە .

مێژووی ئەدەبی کوردی بریتی‌یە لە «مێژووی قسەی جووانی کوردی» ، ئەو قسە جووانە بەشێك لە کولتوور و شارستانیەتی (سڤیلیزا سیۆن)ی نەتەوایەتی دروست دەکا ، قسەی جووان هەموو ژیان دەگرێتەوە :

نیشتمانپەروەری ، کوردایەتی ، نەتەوایەتی ، مرۆڤایەتی ، کۆزمۆپۆلیتی ، دڵداری و دەسبازی و ماچ و مووچ و مێبازی ، بەسەرهاتی نەتەوە ، ساماتی نەتەوایەتی ، تاقی کردنەوەی گەلان ، ژیانی کۆمەلایەتی ، دڵداری‌ی سۆفیزمی ، ئایینی و بیروباوەڕ ، کار کردنی هونەر بە سەر ژیانی مرۆڤ ، هەوڵدان بۆ چاك کردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی ، وێنەکێشانی هەست و نەستی ئاوەوەی ئادەمزاد و گەلێ شتی تریش .

وێنەی ژیانی ڕاستەقینە و ئەو ژیانەی کە شاعیر و نووسەر دروستی دەکا پێویستە بە «قسەی جووان» بگیرێ ، ئەگەر وێنەکە «قسەی جووان» نەبێ ، ئەوا خاوەنی قسەکە شاعیر و نووسەر و هونەرووەر نی‌یە ، بەڵکو شتێکی ترە ، زانایە ، ئەندازیارە ، سیاسی‌یە ، دیپلۆماسی‌یە ، شارەزای پڕۆپاگەندەیە ، هەموو شتێکە تەنیا شاعیر و نووسەر و هونەروەر نی‌یە ، لەبەر ئەوە ، نە ناوی ، نە کردەوەی ناچنە ناو دوو توێی مێژووی ئەدەبی نەتەوەوە .

هەزاران ساڵ پێش سەردەمی ئەمڕۆ لە سەر خاکی کوردستانی ئێستا مرۆڤ کۆن ژیاوە ، ئەمە نەك بە پێی زانستی تازە کە ئەرکیۆلۆجی پێ دەڵێن ، بەڵکو بە پێی گێڕانەوە ئایینی‌یە کۆنەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیش باسی خاك و نەتەوە کراوە لە کتێبی پیرۆزدا ناوی وولاتی ماد هاتووە ، لە قورئانا کەشتی‌یەکەی نووح لە سەر شاخی جوودی (ئارارات) لەنگەری گرتووە پاش نیشتنەوەی تۆفانەکە‌شاخی جوودی بڕبڕەی پشتی خاکی کوردەواری‌یە و زنجیرەیێکە لە زنجیرەکانی شاخی کوردستان .

هەموو نەتەوەیێك پێش دروست بوونی ئێستای کوڕی نەتەوە یا میللەت یا هۆز یا تیرەیێکی کۆن بووە . ئەو نەتەوەیە یا ئەو نەتەوانە خاوەنی یەك ئەدەب بوون ، بە هەر دوو بەشیەوە : ئەدەبی سەرزارو ئەدەبی نووسراو ، ئەدەبی سەرزارەکە زۆر بووە ، بەلاّم ئەدەبی نووسراوەکە کەمتر بووە ، بریتی بووە لە ئەدەبی ئایینی ، یا کتێبی پیرۆزی ئایینی ، یا داستانی قارەمانی ، لە دووایی‌دا ئەم زمانە کۆن بووە و لە کار کەوتووە .

لە سەردەمی دروست بوونی نەتەوە (ناسیۆن = الامة ) ، بە مانای ئەمڕۆ ، واتە دروست بوونی زمانی تازە بۆ ماوەیێکی درێژ دیسانەوە یەك ئەدەب لە ناوەوە

بووە . ئەم ئەدەبە هێزی لە سامانی کۆن وەرگرتووە . ئێمە دەتوانین مێژووی ئەدەبی کوردی لەو ڕۆژەوە دیار بکەین کە بەرهەم بەم زمانە تازەیە پەیدا بووە و تۆمار کراوە . ئەگینا ئەدەبی کوردی بە تایبەتی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) وەکو سامانی نەتەوایەتی دیارە لە باب و باپیرە هەرە کۆنەکانی کوردەوە دەست پێ دەکا .

وەکو ووترا لە کۆنا یەك ئەدەب لە ناوەوە بووە ، ئەمە ئەدەبی باب‌ز باپیرانی کوردی ئێستا بوو ، واتە ئەو نەتەوە و میللەت و هۆز و کۆمەلانەی لە سەر خاکی کوردستانی ئێستا ژیاوون ، ئەمانە ئێرانی‌یە کۆنەکان بوون ، لە پێش ئەوانیش هیندۆئێرانی‌یەکان و لە پێش ئەمانەش هیندۆئەورووپی‌یەکان دەگرێتەوە .

هەر چەندە زیاتر بەرەو سەرەتاکانی مێژووی ئەدەبی کۆن بڕۆین ، ئەوەندە زیاتر لە یەك چوونی ئەدەب و سەرچاوەی وەك یەکی لە نێوان نەتەوەکانی ئەم کۆمەلانە تەسکتر دەبێ ، یا بە شێوەیەکی تر ئەگەر لە سەرەوە دەست پێ بکەین ، واتە لە کۆنەوە ، کۆمەلەکانی هیندۆئەورووپی (ئاری) لە جی‌ی خۆیانا کولتوور و سامانی نەتەوایەتی‌ی خۆیانیان بووە ، کە کۆچیان کردووە و لقێك هاتوونەتە بانی ئێران و هیندستان و لەگەل خەلکی ئەو خاکانە تێکەل بوون ، ئەدەبی سەرزاری خۆیان هێناوە و جەوهەرەکەیان پاراستووە و لە پاشانا شتی تازەشیان خستۆتە سەر ، واتە ئەم هیندۆئێرانی‌یانە بریتین لە «هیندۆئەورووپی + شتی‌تازە = هیندۆئێرانی» ، ئنجا هیندۆئێرانی‌یەکان لە خاکی نوێ‌یان‌دا «ئێرانە وەبچە» شتی تازەیان خستۆتە سەر ، واتە ئەم ئێرانی‌یانە بریتین لە «هیندۆئێرانی + شتی تازە = ئێرانی» ، ئنجا لە ئێرانی‌یەکان نەتەوەی تازە دروست بوون ، کە ئەمە لەگەل سەردەمی پەیدا بوونی ئیسلام ڕێك دەکەوێ .

ئەوەی پێوەندی بە کوردەوە هەبێ تیۆری‌یەکە بەم جۆرە یە «ئێرانی + شتی تازە = کورد» ، ئێ‌ ‌ستی تازەی دووایی جەوهەری نەتەوایەتی‌ی کوردی ئێستایە . بەم جورە من وا ‌زان دەکەم ئەگەر مەسەلەکە بدرێتە دەست کۆمپیووتەر – ئەمەش وەنەبێ کرێکی بەجێ بێ لە زانستی‌ی کۆمەلایەتی‌دا – دەبێ حسێبی تیۆری‌یەکەمان بەم جورە بۆ بکا : لە نیوەی زیاتر بۆ شتی تازە دادەنێ کە جەوهەری نەتەوایەتی‌ی کوردەواری‌ی ڕەسەنە واتە ٥١٪ ، بەشەکانی تر بەم جورە دابەش دەکا : ئێرانی ٢٨٪ (ئەمە جەوهەر و ماکی عەرەبیش دەگرێتەوە کە لەگەل نەتەوە موسوڵمانەکانی تر شارستانی‌یێك دروست دەکەن) ، هیندۆئێرانی ١٤٪ ، هیندۆ ئەورووپی ٧٪ .

**ئەدەبی سەرزار (نەنووسراو)**

لەو ڕۆژەوە کە ئادەمزاد هەستی بە جووانی خۆی و ژیان و سرووشت کردووە تا ڕۆژی تۆمار کردنی ئەو قسە جووانانە تەنیا یەك جۆرە ئەدەب لە ناوەوە بووە ، واتە ئەدەبی میللی . ئەدەبی کۆمەلی ئادەمزادی کۆن لە نەوەیێك بۆ نەوەیێکی تر بە میرات ماوەتەوە ، لە ناو مێشك پارێزراوە و بە دەم و لە ئەزبەر گێڕراوەتەوە .

ئەدەبی نەنووسراو بووە بە سەرچاوەیێکی گرنگ بۆ ئەدەبی نووسراو ، ئەم ئەدەبە لە ناو جەرگەی ئەوەوە هەلقولاوە . گەلێ لە بەرهەمە گەورە و مەزنەکانی گێتی ئەدەبی نەنووسراو بوون و لە پاشانا بوون بە ئەدەبی نووسراو ، زۆربەی هەرە زۆری یەکەمین بەرهەمی کلاسیکی نەتەوەکان گەلێ لە شاکارە ئەدەبی‌یەکانیان ، سەرچاوەی یەکەمیان ئەدەبی فۆلکلۆری بووە ، شاکاری ئەدەبی کوردی «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی ئیلهامی لە «مەمی ئالان»ی ئەدەبی فۆلکلۆری نەنووسراوی خەلکی کورد وەرگرتووە .

لە دەوروبەری بلاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام نەتەوەکانی تازەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست بوون ، لەو سەردەمەدا گێتی‌ی ڕۆمانەکان (لاتین) هێشتا لە ناوەوە بوو لە ئەورووپا ، بەشێکی زۆری ڕۆژئاوای ئاسیا و سەرانسەری قەراغی زەریای سپی‌ی ناوەڕاستیشی گرت‌بووە خۆی .

ئەدەبی میللی نەتەوەکانی هیندۆئەورووپی و هیندۆئێرانی لە ئەفسانە و داستان و حیکایەت و گۆرانی ماوەیێکی زۆر جەوهەری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بوون . ئەدەبی کوردی لە ڕێڕەوی گۆڕرانی‌دا سرووشتی وولاتی کوردەواری و ژیانی کۆمەلایەتی لەگەل ئەم جەوهەرە کۆنانە تێکەل بە یەکتری کرد و لە ناو یەکدا تووانەوە ، بۆیە ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی لە سەرەتاوە تا ئێستاش لە ئەدەبی فۆلکلۆری‌یەوە نزیکە ، هەروەها ئەدەبی کرمانجی‌ی سەروو لە سەرەتاکانی‌دا لە ئەدەبی فۆلکلۆری‌یەوە نزیك بوو ، دەتووانرێ ناوی «ئەدەبی میللی» بۆ دانبرێ تا مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و پرتەوەی هەکاری پەیدا بوون . لە کرمانجی‌ی خوارووودا ئەدەبی فۆلکلۆری هەندێ جار بە هەوای دیالێکتی گۆرانی و ئنجا عەلی‌ی بەردەشانی و هی‌تر لە ناوەوە بوون تا نالی‌ی دامەزرێنەر پەیدا بوو .

**ئەدەبی کلاسیکی**

مەبەس لە ئەدەبی کلاسیکی ئەدەبی نووسراوە پێش ئەوەی کلاسیکی بە نامای ئەدەبی بەرز بەکار بێنین . ئەدەبی کوردی ئەوەی هەول دەدەین لەم ماوەیەدا مێژووی بنووسینەوە ئەدەبی دەوری ئایینی ئیسلامی‌یە . واتە لە و ڕۆژگارانەوە کە زۆربەی خەلکی کورد چوونە سەر ئایینی موسوڵمانی ، بی‌گومان لە ئەنجامی لێکدانی سڤیلیزاسیۆنی هەموو ئەو نەتەوانەی بوون بە ئیسلام (عەرەب وەکو نەتەوەیێکی سامی خاوەن ئاینەکە بوو ، هیندۆئەورووپی ، تورکومەنگۆلی و هی‌تر) بووە هۆی ئەوەی سڤیلیزا سیۆنی ئیسلامی دروست بێ ، وە ئەم دیاردەیە لە چووارچێوەی ئایینی چۆتە دەرەوە و ئەم سڤیلیزا سیۆنە تازەیە ئیسلام دەکا بە کۆمەلێکی ئەنتۆلۆجی – ئەنترۆپۆلۆجی – ئەنتۆگرافی تایبەتی لە خوێندەواری ڕۆشنبیری و بزوتنەوەی ئەدەبی و هونەری‌دا ، ئەم ئەدگار و خاسیەتە تازەیە لە لێکدانی سڤیلیزاسیۆنی هەموو ئەو نەتەوانە دروست بووە کە بوون بە موسوڵمان .

لەبەر ئەوەی سڤیلیزا سیۆنی ئیسلامی کاری لە ئەدەبی کوردی کردووە ، ئێمە لە ژێر تیشکی ئەم بیروباوەڕە ، مێژووی ئەدەبی کوردی دەنووسینەوە ، هەول دەدەین لەم کارەدا هەندێ لە مێژوی هەزار ساڵەی پڕ لە شانازی و نموونەی هەرە جووانی بەرهەمی ئەدەبی کوردی بخەینە ڕوو .

**لەچی‌یەوە ئەدەبی کوردی دەست پێ دەکا ؟**

تێکستی باوەڕ پێ‌کراوی شیعر بە زمانی کوردی سەرەتا و سەردەمی شیعری کوردیمان بۆ دیار دەکا . لێرەدا لە بەر گەلی هۆی تایبەتی کە لە سەرانسەری ئەم کارەدا ڕوون کراوەتەوە ، ئەدەبی کوردی بە دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی

پەیدا بووە . ڕاستە دەبێ سەرەتایێکمان هەبێ بۆ ئەدەبی کوردی بە گشتی ، بەڵام دیارە ئەدەبی هەر دیالێکتێکیش سەرەتای خۆی هەیە .

دوو بەیتەکانی بابا تاهیر بە سەرەتای شیعری کوردی دادەنرێن بە شێوەیێکی گشتی ، بلیمەتیەتی بابا تاهیر لەگەڵ بیر و باوەڕی ئایینی یارسان و سۆفیزمی کۆزمۆس و گۆرانیی میللی ناوچەیی دوو بەیتەکانیان دروست کردووە .

شیعری ئایینی ولیریکی (غنائي) لە دیالێکتی گۆرانیدا کۆنترین شیعری زمانی کوردییە ، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە پەیدا بووە و لە بەرزی و نزمیدا بووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم ، ئنجا کەوتۆتە کزیبەوە تا دوواپی جەنگی گێتیی دووەمیش هەر لە ناوەوە بووە .

شیعری ئایینی و لیریکی لە دیالێکتی کرمانجیی سەروودا لە پاش ڕووداوە هەرە گرنگەکەی مێژووی کورد ، جەنگی چالدیران (١٥١٤) لە پێشانا بە شێوەی شیعری میللی ، ئنجا شیعری خوێندەواریی بەرز کەوتە ناوەوە .

شیعری لیریکی (غەزەل و قەسیدە) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا لە پاش دروست کردنی پایتەخت (سلێمانی) پەیدا بوو ، ئەم بزووتنەوە ئەدەبیە کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی لە دووا ڕۆژدا .

## شیعری کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە ، بە تایبەتی لە بابەت قەوارەوە ، دەکرێ بە دوو بەشەوە ، یەکەمیان «لیریك» ، دووەمیان «ئیپیك» .

لیریك بە پارچە شیعرێکی کورت و قەوارە بچووك دەووترێ ، ئەمە تاك (فرد) ، چووارین (رباعیە) ، دوو بەیت ، پارچە (قیتعە) ، غەزەل ، قەسیدە و گەلێ شتی تریش دەگرێتەوە .

هەرچی «ئیپیك» ە ، بە شیعرێکی درێژ و قەوارە گەورە دەووترێ ، دەتووانین گەلێ زاراوەی تر بۆ ئەم جۆرە هونەرە بدۆزینەوە ، وەکو چیرۆکی شیعری ، داستان مەلحەمە، کورد خۆشی «بەیت»ی پێ دەڵێ بە تایبەتی وەکو زاراوەیێك لە ئەدەبی میللیدا بە کار دەهێنرێ .

## لیریك

لیریکی کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە لەم وێنانەی خووارەوەدا خۆی دەنوێنێ :

١ – تاك : بریتییە لە دێرە شیعرێکی عەرووزی لە دوو نیوە دێڕ شیعر پێك هاتووە ، هەر دوو نیوە دێڕەکە دەبێ لە سەر یەك قافیە بێ (AA)ئەم جۆرە شیعرە بۆ پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ووتەیێکی کورتی دانایانە و بیرێکی ژیری فەلسەفیانە دا دەنرێ . گەلێ دێرە شیعری غەزەل و قەسیدە بە تەنیا بۆ ئەم مەبەسە دەست دەدا ، ئەگەر یەکێتیی مانای تێدا بێ ، بەڵام دیارە تاکی پێ ناووترێ ، واتە تاك دەبێ تەنیا یەك دێڕ شیعر بێ ، وەکو نالی لە تاکێکی دەڵێ :

**سەوتی نەغمەی بلبلە یا چەهچەهە هەی خرخاڵیە**

**دەنگی سۆلە یا لە ژێر پێی نالە نالی (نالی)یە**

یا پرتەوی هەکاری لە تاکێکیدا دەڵێ :

**هەر کەسێ زەررەك ل بالە ، پرتەوا نوورا جەلالە**

**ڕوو شرینە ب خەتت و خالە ، چێك و ساحیب کەمالە**

٢ – چووارین (رباعیة) : بریتییە لە شیعرێك لە دو نیوە دێرە شیعری عەرووزی پێك هاتووە ، واتە چووار نیوە دێڕ شیعر . نیوە دێڕی یەکەم و دووەم و چووارەم لە سەر یەك قافیە دەبن ، بەڵام نیوە دێڕی سێیەم دەگۆڕێ ، ئەمە چووارینی بێ گون (کونك) ی پێ دەڵێن . خۆ ئەگەر هەر چووار نیوە دێرەکە لە سەر یەم قافیە بن ئەمایان چووارینی تەواوی پێ دەووترێ . چووارینی بێ گون لە چووارینی تەواو زیاترە لە ئەدەبی کوردیدا .

چووارین لە سەر کێشی عەرووزی هەزەج و ئەو کێشانەی لەوەوە دەرهێنراوون دەهۆنرێتەوە ، بەڵام لە ڕێڕەوی گۆڕانی شیعری کوردی بە درێژایی ڕۆژگار چووارین بە کێشەکانی تری عەرووزیش کەوتۆتە ناوەوە .

چووارین پارچە شیعرێکە یا کارێکی ئەدەبی سەربەخۆ و تەواوە بۆ مەبەسی سۆفیزم و دڵداری و فەلسەفە و مەی و مەیخانە و پەند و قسەی نەستەق و دانایی و شتی تر بەکار دەهێنرێ . لە ئەدەبی تازەشدا هەیە و بۆ مەبەسی سیاسی و ڕەخنەی کۆمەلایەتی بەکار دەهێنرێ .

کۆنترین شاعیری کورد بابا تاهیر ، بەم جۆرە شیعرە زۆربەی هەرە زۆری هونەری خۆی نووراندووە ، هەر وەها وەبێ ئەوەش بزانرێ کە زۆرتر زاراوەی «دوو بەیت» بۆ چووارینەکانی بابا تاهیر بە کار دەهێنرێ ، چونکە کێشی سووك و سفت و ناوەرۆکی دڵداری – سۆفیزم لە چووارینی تر جیای دەکاتەوە .

وەکو پرتەوی هەکاری لە چووارینێکیدا دەڵێ :

**ئاگرێ عەشقێ دسۆژیت جانێ عاشقمیسلی نار**

**ئاگرەك پڕ جۆش وپڕ تاب و حەرارەت بێ قەرار**

**عاشق و مەعشووقێ یەك قەلب و زبان و یەك دلن**

**دائیما هەر وەقتەکی ناسەبرن سەبرێ سەبووری تابدار**

یا حەمدیی ساحیبقران لە چووارینێکیدا دەڵێ :

**باسی کوڵمی تۆ بنووسێ چۆن قەلەم گوڵ ناگرێ**

**یا بکا یادی دەمت غونچە وەکو چڵ ناگرێ**

**چۆن بە سەر نێرگس نەگیری ناوی چاوت بێتە ناو**

**وەك وەنەوشە بۆ مل و خاڵت بە کەچ مل ناگرێ**

٣ – دوو بەیت

زاراوەی دووبەیت لەگەڵ چووارین لە ئەدبی کوردیدا هاوسەرن ، لە باتی یەکتری بەکار دەهێنرێن ، چونکە لە زۆر ڕووەوە لە یەکتری دەکەن . دوو بەیت واتە دوو دێڕە شیعر ، ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە دێڕی یەکەم و دووەمی هەموو غەزەل و قەسیدەیێکی عەرووزی لە ڕووی ڕوخسارەوە وەکو دوو بەیت (چووارین) وایە ، چونکە هەر دوو نیوە دێڕی یەکەم لە سەر یەك قافیە دەبن ،

هەرچی دێڕی دووەمیشە نیوە دێڕی یەکەمی دەگۆڕێ و نیوە دێڕی دووەمی لە سەر قافیە بنچینی یەکەی شیعرەکە دەبێ ، ئیتر هەر دوو دێڕە شیعرەکە (دوو بەیت)ە وەکو چوارین خۆیان دەنوێنن.

بەڵام ئێمە لێرە مەبەسمان ئەوەیە دوو بەیت بۆ هونەرێکی شیعری تر لە کوردیدا بەکار دەهێنرێ ، ئەم هونەرە لە ئەدەبی دیالێکتی گۆرانیدا ئاشکرا و دیارە ، بە تایبەتی لە شیعری ئاینی یارسان . دوو بەیت لە سەر کێش دە سیلابی و وەستان لە ناوەڕاست دەبێ و هەر چوار دێڕە شیعرەکە لە سەر یەك قافیە دەبێ . شیعری بابا سەرهەنگی دەودانی و پیر شالیار و شاخۆشین و بابا ناووس و هی تر بەم شێوەیە خۆیان دەنوێنن.

شیعری لیریکی خۆماڵی بە هەموو بابەتەکانییەوە لە دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجی سەرووا نموونەیێکی ڕەسەنە لە ئەدبی کوردی دا زۆربەی لە سەر بنچینەی بەند دەهۆنرێتەوە ، هەر بەندی بە شێوەی دوو بەیت دەکەوێتە ڕوو . ئەم بابەتە شیعرە هیچ پێوەندییێکی بە کێشی عەرووزەوە نییە ، بەڵکو لە سەر کێشی سیلابی خۆماڵی دادەنرێ ، کە ئەمیش واتە کێشی خۆماڵی کوردی لەگەڵ کێشی شیعری زمانە هیندۆئەورووپی گرووپەکانی تری لە زمانانی هیندۆئێرانی و ئێرانی لە یەك ڕەگ و ڕیشەن . کێش بنچینەیی سیلاب بە تایبەتی لە دیالێکتی گۆرانی دە کەرتی‌یە و وەستانی لە ناوەڕاست دایە ، ئەمە کێشی هەرە باوی شیعری فۆلکلۆری کوردی‌یە لە هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا . هەرچی قافیەشە لە سەر بنچی جووت قافیە دادەمەزرێ ، واتە دووایی نیوە دێڕی یەکەم لەگەڵ نیوە دێڕی دووەم لە هەر دێڕە شیعرێکدا لە سەر یەك قافیە دەبی (CC BB AA)

**٤ - پارچە لیریکی دیالێکتی گۆرانی**

**شیعری لیریکی لە دیالێکتی گۆرانیدا لە باوترین هونەری شیعریە لە ئەدەبی کوردیدا . زۆربەی هەرە زۆری شیعر لەم جۆرە هونەرەیە ، لە ڕووی کێش و قافیەوە بە شێوەی خووارەوە خۆی دەنوێنێ :**

**(١) شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە دە کەرتی دەبێ و وەستان لە ناوەڕاست دا دەبێ . دێڕی یەکەم تەنیا پێنج کەرت دەبێ ، دەشێ ئەو نیوە دێڕە پێنج کەرتی‌یە دووبارە بکرێتەوە و دەبێتە دێڕێکی تەواو ، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیە دەبێ . واتە دێڕی یەکەم و دووەم لە سەر یەك قافیە دەبێ و سێیەم و چووارەم لە سەر قافیەیێکی تر . بەم جۆرە تا دووایی شیعرەکە ، ئەمە «مەسنەوی»شی پێ دەووترێ . ئەگەر دێڕی یەکەم و دووەم بە دێڕێك حسێب بکەین ، واتە بە پێی زاراوەی شیعری عەرووزی کە «تاك»ی پێ دەووترێ ، بەم جۆرە نیوە دێڕی یەکەم دووەم لە سەر یەك قافیە دەبێ ، هەروەها دێڕەکانی تریش (CC BB AA) .**

(٢) شیعرەکە لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو شیعری پێشوو دەبێ ، بەڵام هەموو دێڕەکانی لە سەر یەك قافیە دەبن ، واتە یەکێتی‌ی قافیە تێدا دەبێ .

(٣) شیعرەکە بە سەر کۆمەڵێك بەند (کووپلە) دابەش دەکرێ ، هەر بەندی سێ نیوە دێڕ شیعر دەبێ و قافیەی تایبەتی‌ی خۆی دەبێ (CCC BBB AAA) .

(٤) شیعرەکە لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو شیعری پێشوو دەبێ ، بەڵام هەر بەندی چووار نیوە دێڕ شیعر دەبێ و قافیەی تایبەتی‌ی خۆی دەبێ (CCCC BBBB AAAA) .

(٥) شیعرەکە لە هەموو ڕووییێکەوە دیسانەوە وەکو شیعری پێشوو دەبێ ، بەڵام هەر بەندی شەش نیوە دێڕە شیعرو لە سەر یەك قافیە دەبێ (CCCCCC BBBBBB AAAAAA) .

**(٦) شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە هەشت کەرتی دەبێ ، بەڵام لە ڕووی قافیەوە ڕەنگاو ڕەنگ دەبێ ، بە زۆری جووت قافیە دەبێ (مەسنەوی) واش ڕێك دەکەوێ یەکێتی‌ی قافیەی تێدا دەبێ ، واتە هەموو شیعرەکە لە سەر یەك قافیە دەبێ ، هەندێ جاریش هەر سێ دێڕە شیعر لە سەر یەك قافیە دەبێ ، ئەمە لە شیعری عابیدینی جاف‌دا ئاشکرا و دیارە .**

**(٧) شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە لە دە کەرت زیاتر دەبێ وەکو هەزەلی شیعری عەرووزی خۆی دەنوێنێ .**

**(٨) شیعرەکە لە سەر بنچی بەند دادەمەزرێ ، هەر بەندی لە حەوت دێڕ (چووار نیوە دێڕ) پێك دێ ، هەمووی لە سەر یەك قافیە دەڕوا ، دێڕی دووایی (دوو نیوە دێڕ) قافیەی جیا دەبێ و لە هەموو بەندێکدا دووبارە دەبێتەوە ، ئەم هونەرە لە «تەرجیع بەند» دەکا .**

(٩) بە دەگمەن غەزەل لە سەر کێشی عەرووزی ڕێك دەخرێ و یەکێتی‌ی قافیەی تێدا دەبێ ، وەکو غەزەل و قەسیدەی شیعری ئیسلامی .

**٥ - پارچە لیریکی کرمانجی**

**شیعری لیریکی دیالێکتی کرمانجی‌ی سەروو لە گەلی ڕووەوە یەك بابەتە لەگەڵ شیعری لیریکی گۆرانی بە زۆری لە ڕووی کێش و قافیەوە وەك لای خووارەوە خۆی دەنوێنێ :**

(١) لیریکی هەشت کەرتی لە ڕووی کێشەوە لە سەر بنچینەی بەند دادەمەزرێ . هەر بەندی چوار دێڕە شیعرە ، واتە وەکو دوو بەیت یا چووارین خۆی دەنوێنێ ، لایەنگرانی عەرووز هەر بەندێك (دوو بەیت = چووارین) دەکەن بە دێرە شیعرێك (دوو نیوە دێڕی عەرووزی) و موسەممەتی پێ دەڵێن . بەشێك لە شیعرەکانی عەلی‌ی هەریری و مەلای باتەیی لەم بابەتەن .

(٢) لیریکی حەوت کەرتی لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو شیعری پێشوو وایە ، تەنیا ئەوە هەیە لە ڕووی کێشەوە هەر دێڕەی حەوت کەرتە .

**٦ - پارچە (قیتعە)**

**لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو غەزەل وایە ، هەندێ بە غەزەلی دادەنێن ، هەندێکی تر جیای دەکەنەوەو ناوی دەنێن پارچە (قیتعە) ، مەسەلەش تەنیا ژمارەی دێڕی شیعرەکەیە ، لایەنگرانی پارچە لە سەر ئەو باوەڕەن شیعر ئەگەر لە چووارین (دوو دێڕ = چووار نیوە دێڕ) ڕەت بێ تا شەش دێڕ (دووازدە نیوە دێڕ) دەبێ پارچەی پێ بووترێ ، بەڵام ئەگەر حەوت دێڕ بێ ئیتر غەزەلە . هەرچی لایەنگرانی زاراوەی «غەزەل»یشە لە سەر ئەو باوەڕەن هەر شیعرێك لە دوو دێڕ (چووار نیوە دێڕ) ڕەت بکا ئیتر غەزەلە .**

نالی لە پارچەیێکی پێنج دێڕیدا دەڵێ:

**دەروونم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ**
**دڵم گەرم و هەناسەم سەردە بێ تۆ**
**خەریکی شەشدەری هات و نەهاتم**
**خەلاسیم قەت نی‌یە لەم نەردە بێ تۆ**
**لیباسم ماتەمی‌و شینە لە شین دام**
**سرێشکم سوور و ڕەنگم زەردە بێ تۆ**
**عەزیزم دڵ ڕەقە خۆم فەرد و تەنیام**
**دەترسم بمکوژێ ئەم دەردە بێ تۆ**
**بە بێ دیداری تۆ خۆ لاڵە (نالی)**
**عەجەب هەستاوە ئەم چەند فەردە بێ تۆ**

### ٧ - غەزەل

بریتی‌یە لە پارچە شیعرێکی کورت لە سەر یەك کێشی عەرووزی و یەك قافیە دەبێ. هەندێ لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە سێ دێڕەوە غەزەلی پێ دەووترێ، هی تریش دەڵێن لە حەوت دێڕەوە دەست پێ دەکا.

هەر وەها لە بابەت ژمارەی گشتی‌ی دێڕەکانی‌یەوە دیسانەوە بیروڕای جیاواز هەیە، هەندێ دەڵێن تا دەگاتە دووازدە دێڕیش هەر غەزەلە، هی تریش دەبگەیەننە پازدە دێڕ. هی واش هەیە دەڵێن تا هەژدە دێڕیش هەر غەزەلە و لە پاشانا دەبێ بە قەسیدە.

زاراوەی غەزەل لەم ماوەیەدا تەنیا پێوەندی بە ژمارە و قەوارەی بەرهەمی شیعری‌یەکەوە هەیە، بە هیچ جۆرێ مەبەس لە مانای فەرهەنگی ووشە کە نی‌یە، «تا غەزەلێکم بۆ بخوێنەوە» مەبەس ئەوەیە شیعرێکی لەو قەوارەیەی کە باسمان لێوە کرد بۆی بخوێنێتەوە، جا ناوەڕۆکەکەی گرنگ نی‌یە هەر چی دەبێ با بێ. بێ گومان لە بنەڕەتیش‌دا ووشەی «غەزەل» هەر مانای دڵداری‌یە، ئەوەش ڕاستە کە شیعر بە خۆشەویستی و ئەڤینی دەستی پێ کردووە.

مەلای جزیری لە غەزەلێکی‌دا دەڵێ:

**سەلوا سەهێ قەد خەملی لەو کەملی مەستانە ڕەقس**
**وەر سوحبەتێ گەر قابل دێ بێت و رەت شاهانە ڕەقس**
**مەستان مەستان نووشا نووش فەرقەف د جامان هالە جوش**
**ما دێ بمینت کەس ل هوش وەقتێ کو بین دووردانە ڕەقس**
**سوحبەت ب سازان هالە ساز پێ مەووجی دەریایی ڕاز**
**دا دل ژ نوور بابی مەجاز وی کەشتی‌یێ سوککانە ڕەقس**
**مەحبووب ب عەینێ کەوکەبن ڕەقسا کو لێ دلبەر هەبن**
**سەد جان کرامێ من هەبن بالێمە ڕێ لەرزانە ڕەقس**
**کرشمە لو ڕازا بەری عارف لە نابن لێ دەری**
**حەتتا د نیڤا ئاگری لەو خەف نەبت پەروانە ڕەقس**
**پەروانەڤ شەمما گەشین زولفین وە نازك ڕاوەشین**
**شەوکێن د دلدا پێ خوەشین مەژ پەنجە پێن شێرانە ڕەقس**
**عالا و ئاڵێی قورمزین ئەسلان د بەر پەرزین**
**نێرکس د باغان ئەرووزین نەیشەککەران نیشانە ڕەقس**
**وەقتێ کو بابن ئەرغەوان گولچیچەك و ئەرحین جوان**
**ڤێرا نەبێ سەلوا ڕەوان عارف ل فەرقێ جان: ڕەقس**
**لێوۆ شەکەر خەندێ برین دەستێ سپی زەندێ برین**
**دیسا ب گۆلەندی برین دەردێ (مەلی) دەرمانە ڕەقس.**

### ٨ - قەسیدە

قەسیدە لە ئەدگاری‌دا وەکو غەزەل وایە، تەنیا لە ژمارەی دێڕ لەگەڵی‌دا دەگۆڕێ. قەسیدە بریتی‌یە لەو پارچە شیعرەی کە لە هەژدە دێڕە شیعر تێپەڕ دەکا. واتە غەزەل لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەگەر لە هەژدە دێڕ تێپەڕی کرد دەبێ بە قەسیدە. بێ گومان قەسیدە بۆ ڕووداوی درێژ و قسەی زۆر بەکار دەهێنرێ، بە تایبەتی ناوەڕۆکی قارەمانی و ڕووداوی کۆمەڵایەتی و هەندێ جاریش دڵداری و ئاینی (موناجات ونەعت) وهی تریش دەبنە هەوێنی ئەم جۆرە شیعرە. گیانی مەلحەمی و ڕووداوی چیرۆکی لە هەندێ قەسیدەدا دەبینرێ، بەڵام بە هیچ جۆرێ قەسیدەی عەرووزی نابێ بە چیرۆکی شیعری یا مەسنەوی یا داستانی خۆماڵی و ئیپیك (ئێپۆس) و پۆێم (چیرۆکی شیعری ئەورووپایی) حسێب بکرێ.

### ٩ - شیعری پێنجینە بەند = پێنجین (موخەممەس)

جۆرە هونەرێکە لە ڕووی ڕوخسارەوە بریتی‌یە لە پارچە شیعرێك لە سەر کێشێکی عەرووزی دەبێ و بە سەر چەند بەندێك دا بەش دەکرێ هەر بەندی بریتی‌یە لە پێنج نیوە دێڕ شیعر، هەموو نیوە دێڕەکان لەبەندی یەکەم‌دا لەسەر یەك قافیە دەبن هەرچی بەندەکانی تریشە چووار نیوە دێڕی یەکەم لە سەر یەك قافیە دەبن، کە ئەمە قافیەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە شیعرەکەیە، نیوە دێڕی پێنجەمیش لە هەموو بەندەکان دا لە سەر قافیەی بەندی یەکەم دەبێ

**(ACCCC ABBBB AAAAA)**

شاعیرانی کوردی کلاسیك ئەم جۆرە قاڵبەیان بۆ بەشێك لە هونەری شیعریان بەکار هێناوە، بە زۆریش قەسیدەی پێنجین بۆ ناوەڕۆکی درێژ بەکار دەهێنرێ، هەروەها ئەم بابەتە شیعرە بۆ ماوەیێکی زۆر باو بوو، لە پاشانا بووە هۆی مشتومالێ کردنی هەست و زەوقی نەوەکانی داهاتوو، ژمارەیێك لە شاعیرانی کۆن و تازەی کورد بایەتی پێنجینیان بەکار هێناوە بۆ دەربڕینی هەست و وێنە گرتنی خەیال و بزووتنەوەی دڵ و دەروونیان شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری و ئەدەب و بێخود و هی‌تر بە پێنجینیان ئەدەبی کوردی‌یان دەوڵەمەند کردووە.

### ١٠ - شیعری چووارینە بەند (مورەببەع)

شیعری چووارینە بەند لە ڕووی ڕوخسارەوە بریتی‌یە لە پارچە شیعرێك لەسەر بنچینەی بەند دادەمەزرێ، هەر بەندی بریتی‌یە لە چووار نیوە دێڕ شیعر، هەموو نیوە دێڕەکان لە بەندی یەکەم‌دا لە سەر یەك قافیە دەبن، کە ئەمە قافیەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە شیعرەکەیە، نیوە دێڕی چووارەمیش لە هەموو بەندەکان‌دا لە سەرقافیەی‌بەندی یەکەم دەبێ (ACCC ABBB AAAA) واتە لە

**دروست بووە وەکو پێنجین وایە ، تەنیا جیاوازیی لەگەڵ ئەودا ئەوەیە کە ئەمیان هەر بەندی بریتییە لە چووار نیوە دێڕ . شیعری چوارینە بەند لە دیوانی شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری وبێخود و هی‌تر بەدی بدەکرێ .**

### ١١ – پێنج خشتەکی

پێنج خشتەکی بریتییە لە بەرهەمی دوو شاعیر . ئەو شاعیرەی پێنج خشتەکی دروست دەکا ، واتە شاعیری دووەم ، شیعری شاعیرێك دیاری دەکا ، سێ نیوە دێڕ شیعر دەخاتە سەر نیوە دێڕی یەکەمی هەموو دیڕە شیعرەکانی غەزەلەکە ، واتە هەر دێڕە شیعرێك (دوو نیوە دێڕ) دەبێ بە پێنج نیوە دێڕ شیعر ، سێ نیوە دێڕی یەکەم هی شاعیری دووەمە و دوو نیوە دێڕەکەی تر هی شاعیری یەکەمە ، لە بەر ئەوەیە پێنج خشتەکی پێ دەڵێن . ئیتر بەم ڕەنگە وەکو چۆن خاوەنی غەزەلەکە نازناوی خۆی دەخاتە دێڕی دوایی شیعرەکەیەوە ، شاعیری دووەمیش نازناوی دەخاتە یەکی لەو سێ نیو دێڕە شیعری کە بۆ دێڕی هەرە دوایی ڕێکی دەخا .

ناوونیشانی پێنج خشتەکی لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی بەم جۆرە دەبێ «پێنج خشتەکی‌ی سالم لە سەر غەزەلێکی نالی» ، واتە سالم غەزەلێکی دیارکراوی نالی کردووە بە پێنج خشتەکی (تەخمیس کردووە) پێنج خشتەکی بە شێوە وەکو پێنجین وایە ، بەڵام ئەویان لە بەرهەمی دوو شاعیرە و پێنجین بەرهەمی شاعیرێکە .

### ١٢ – تەرجیع بەند

بریتییە لە کۆمەڵێك غەزەل ، بە زۆری لە دووازدە پارچە غەزەل پێك دێ ، دەبێ ژمارەی دێڕی غەزەلەکان هێندەی یەك بن ، واتە غەزەلی یەکەم چەند دێڕ بێ پێویستە غەزەلەکانی تریش هێندەی ئەو بن ، لێرەدا هەر غەزەلێك لە دووزادە دێڕ تێناپەڕێ . هەموو غەزەلێکی تەرجیع بەندەکە بە دێڕە شیعرێکی دیاری کراو دوایی یان دێ ، ئەمە وەکو کلیل یا خەرجە وایە . بە گشتی ئەم جۆرە شیعرە بۆ مەبەسی ئایینی بەکار دەهێنرێ ، دیارە لە بنەرەتیش‌دا بۆ گۆرانی‌ی ئایینی دهۆنرێتەوە ، لە مەولوود و کۆ بوونەوە کۆڕی زیکری دەروێشان گۆرانی بێژ بە دەم ئاوازی دەف و تەپڵەوە غەزەلی یەکەم دەچڕێ تا دەگاتە دێڕی دوایی ، ئەمەیان کۆرسی دەف زەنەکان یا دانیشتووان بە ئاوازەوە دەیگێڕنەوە . غەزەلی دووەم یا هەر ئەو گۆرانی بێژە دەیڵێ یا گۆرانی بێژێکی تر ، دیسانەوە دێڕی دوایی بۆی دەگێڕنەوە ، بەم جۆرە تا غەزەلەکان هەموویان تەواو دەبن .

لە ئەدەبی تازەدا ئەم هونەرە بۆ مەبەسی کوردایەتی وسیاسی و کۆمەلایەتی و نیشتمانی بەکار هێنراوە . بۆ بەڵگە حەمدی‌ی صاحیبقران زنجیرەیێك لەم جۆرە شیعرەی داناوە بە ناوی «تەرجیع بەندی نیشتمانی» یەوە .

### ١٣ – تەرکیب بەند

وەکو تەرجیع بەند وایە ، تەنیا جیاوازی یەکەی لەوە دایە کە دێڕی دوایی (خەرجە) ی هەموو بەندێك دەگۆڕێ ، واتە دێڕەکە دووبارە و سێ‌بارە نابێتەوە وەکو تەرجیع بەند .

### ١٤ – موستەزاد

شاعیر لە هونەری موستەزاددا جۆرە وەستایی‌یێکی ئەندازیاری دەنوێنێ بەوەی غەزەلێك دەهۆنێتەوە لە سەر یەك کێش و یەك قافیە .

لە پاشانا هەموو نیوە دێڕێك ـ بە ڕستەیێك دەبەستێتەوە ، ئەم ڕستەیە زیادەکەیە کە دەچێتە سەر هەموو نیوە دیڕەکانی شیعرەکە ، بە مەرجێ ئەم زیادانەش بە تەنیا هەموویان لە سەر یەك کێش و یەك قافیە دەبن ، بەڵام ئەوە هەیە غەزەلەکە بە تەنیا بێ زیادەکان غەزەلێکی ئاسایی‌یە ئەگەر بە بێ زیادەکانیش بخوێنرێتەوە مانا بە دەستەوە دەدا ، بەڵام زیادەکان ئەگەر بە تەنیا وەکو برهەمێکی تایبەتی بخوێنرێتەوە مانای تەواو بە دەستەوە نادەن ، بەڵکو ئەم زیادانە هەر نیوە دێڕێك دەبێ بە شی کەرەوەو ڕوون کەرەوەی ئەو نیوە دێڕەی کە دەچێتە سەری .

شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری و نالی بابەتی موستەزادیان هەیە .

چەند دێڕێك لە موستەزادی نالی :

**ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادە وو کەوتوو**
**تا ماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم**
**قوربانی وەفاتم**
**تۆ یووسفی ئەو حوسنی لە سەر میسری جیهانی**
**من پیرم و فانی**
**لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم ونە مردووم**
**هەر وا بە تەماتم**

### ١٥ – مولەممەع

مولەممەع ئەو شیعرەیە کە بە زیاتر لە زمانێك ڕێك دەخرێ ، بێ گومان لە شیعری کوردی دا بۆ مەبەسی مولەممەع زمانانی عەرەبی و فارسی وتورکی بەکار دەهێنرێن . شاعیری کورد لەم جۆرە هونەرەدا هەوڵ دەدا هەندێ نیوە دێڕ یا دێڕی تەواوی شیعر بە زمانێك یا زیاتر لەو سێ زمانە دەرببڕێ . دیارە دەبێ لە مانادا هەموو ڕستەکان بە زمانە جۆراوجۆرەکانەوە لەگەڵ یەکتری بگونجێن و مەبەسی گشتی‌ی شاعیر بە دەستەوە بدەن .

لە ئەدەبی کوردی‌دا مولەممەع لای ئەم شاعیرانەی خووارەوە و هی تریش دەبینرێ :

(١) مەلای جزیری عەرەبی و فارسی بەکار هێناوە
(٢) نالی عەرەبی بەکار هێناوە
(٣) سالم فارسی بەکار هێناوە
(٤) مستەفا بەگی کوردی فارسی و عەرەبی و تورکی بەکار هێناوە
(٥) شێخ ڕەزا فارسی و عەرەبی و تورکی بەکار هێناوە

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە تێکهەڵکێشی ڕستەی زمانی بێگانە لە شیعری کوردی‌دا مولەممەع نی‌یە ، بەڵکو ئەویش هونەرێکی ترە و «تێکهەلکێش = تضمین»ی پێ دەڵێن ، بە زۆری ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر بۆ ئەم مەسەلەیە لە شیعری ئایینی‌دا موناجات و نەعت بەکار دەهێنرێ .

## ئیپک

ئیپك (ئیپۆس) ئەو جۆرە بەرهەمەیە کە گیانی چیرۆکی تێدایە لە جێگە و سەردەم و قارەمان و جوولانەوە ، لە ڕووی قەوارە و کێش و قافیەوە بە سەر دوو بەش‌دا دابەش دەکرێ :

١ – بەیت : بە قەوارە زۆر درێژ نی‌یە ، زمانی میللی‌یە ، ڕستەی ساکارە ، زۆربەی خەڵك تێ‌ی دەگا . کێشی خۆماڵی (سیلاب)ە ، قافیەی ڕەنگاو ڕەنگە و لەسەر بنجی بەند (کوپلە)دا دەمەزرێ ، بۆ مەبەسی گۆرانی ووتن دادەنرێ .

٢ – چیرۆکی شیعری (داستان = مەسنەوی) : بە قەوارە درێژە ، زمانی سفت‌و بەنو (کلاسیکی)یە ، زیاتر پێوەندی بە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەوە هەیە ، لە ڕووی کێشەوە عەرووزی – سیلابی‌یە ، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیە (موزدەویج)ە (AA BB CC DD...) چیرۆکە شیعری‌یەکانی «مەم و زین» و «شیرین‌و خوسرەو» و «لەیلا و مەجنوون» و «یووسف و زولەیخا» و «مەنیجە و بیژەن» و گەلێکی تریش لە شاکارەکانی ئەم بەرهەمەن لە ئەدەبی کوردی‌دا .

### کەرەستەی جوانکاری‌ی غەزەل و قەسیدە

زمانی شیعری نەتەوە موسوڵمانەکان (ووشەی فەرهەنگی و لێکسیکۆن) کارێکی گەورەی کردۆتە سەر غەزەل و قەسیدەی کوردی ئەوەی پێڕەوی عەرووز و یەکێتی‌ی قافیەی کردووە ، بە تایبەتی لە سەدەکانی شازدەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم . غەزەل و قەسیدەی کوردی بە گشتی و ئەوەی خەریکی سوفیزم و پاڕانەوە (موناجات) و نەعت (بۆ پێغەمبەر) و پێدا هەڵدان (مەدح) و شانازی (فەخر) بوون کەوت بوونە ژێر کار و زەبری زمانی عەرەبی‌یەوە ، بە تایبەتی ووشە و زاراوەی زۆری فەلسەفە و سۆفیزم و شەریعەت و دەروێشیزم (تەریقەت) لە ناو ئەم جۆرە شیعرەدا بەدی دەکران .

ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵە ووشە و ڕستە و زاراوانە لە غەزەل و قەسیدەی شیعری کلاسیکی فارسی تورکیش‌دا بە کار دەهێنران جگە لەمە ، تا پلەیێك شیعری کوردی کەوتبووە ژێر کاری بەلاغە (ڕیتۆریك)ی عەرەبیش . یاری کردن بە ووشە و مانا ، دروست کردنی تەنگوچەڵەمە بە ئانقەست ، دانانی شیعری بێ نوختە ، ڕێك خستنی شیعری داخراو (موعەمما) بەکێ بوو ئەدگارە گرنگ و دیارەکانی شیعری کلاسیکی کوردی .

هەموو جۆرە جوانکاری‌یە ووشەیی و مانایی‌یەکانی عەرەبی لە ڕووی مەشق و پراکتیکەوە لە شیعری کلاسیکی کوردی بەدی دەکرێ ، وەکو : حوسنی فەساحەت ، تەرسیع ، فەواسیل ، تەبدیل ، جیناس و هەموو بەشەکانی ، ئیستیعارە ، سیحەتی تەقسیم ، سیحەتی موتەقابیلات ، موتابەقە ، تەزمین ، ئیستیحالە ، هەموو بەشەکانی بەلاغەت ، تەرجیع هتد . . .

ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی کوردی‌دا لەگەڵ ئەوەی تەنیا سوودی ڕۆشنبیر و خوێندەواری بەرزی تێدا بوو ، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی نەخوێندەوار ونیچمە خوێندەوار تێ‌ی نەدەگەیشتن و کەڵکیان لێ وەرنەدەگرت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا سوودی زۆر بوو ، بەوەی کە زمانی کوردی دەوڵەمەند کرد ، گەلی ووشە و زاراوەی هێنایە ناو زمانی ئەدەبی‌یەوە هەروەها تەکنیکی شیعر و جۆری بیر کردنەوەی شاعیرەتی بلاو کردەوە و وێنەو مانای تازەی خستە ناو گێتی‌ی ئەدەبی کوردی‌یەوە بەم ڕەنگە ئەگەر کەڵکی بۆ سەر دەمی خۆی زۆر نەبوونێ چونکە خوێندەوار کەم بوون ، کەڵکی بۆ نەوەکانی داهاتوو و ئێستا و دووا ڕۆژیش زیاتر دەبێ . ئەو بەرهەمە کلاسیکی یە بەرزانە هەمیشەیین و بۆ هەموو سەردەم و ڕۆژگارێك دەست دەدەن چونکە ماکی نەمری دایهێناوون .

### ناز ناو (لەخەلوس)

نازناو یەکێکە لە کردەوەکانی شاعیری کورد ، بریتی‌یە لەوەی بە زۆری لە دێڕی دووایی‌دا ، یا پێش ئەو لە هەر غەزەل و قەسیدەیێك‌دا نازناوی خۆی تۆمار دەکرد . هەندێ جار ئەم نازناوە پێوەندی بە ئایینی یا بنەماڵە . یا سۆفیزم یا نیشتمان پەروەری یا موعەمما یا وەرگرتن لە شاعیرانی غەزەلی نەتەوەکانی تری موسوڵمانەوە بووە ، وەکو : مەلا (مەلێ) ، خانی‌ پرتەو ، شەفیع ، خانە ، بێسارانی ، نالی ، سالم ، کوردی ، مەولەوی ، حاجی ، ئەدەب ، حەریق ، مەحوی ، وەفایی ، ناری ، نیعمەتی ، بێخود ، خاکی ، خەستە ، مەجدی . ئاهی . ساقی (صافی) ، حەمدوون ، حەمدی ، ئەسیری (ئەثیری) ، زێوەر ، کانی ، کەمالی و هی‌تر . .

بەکار هێنانی نازناو لە لای شاعیرە تازەکانیش‌دا باوە ، بەڵام ئەوە هەیە وەکو ناوێك شاعیرەکان پێ‌ی دەناسرێن و بەرهەمیان لە دیوان و ڕۆژنامەو گۆواردا بەو ناوە بلاو دەکەنەوە ، ئەگینا وەکو شاعیری کۆن نازناویان تێکهەڵکێشی ناو شیعرەکانیان ناکەن چونکە ئەگەر کۆنەکان ترسی ئەوەیان بووبێ شیعرەکانیان بدزرێن ، چاپەمەنی و ڕۆژنامە گەری لە سەر دەمی ئێستادا ئەو ترسەی لە ناو بردووە . بە زۆری نازناوی شاعیری سەردەم پێوەندی‌ی بە ژیانی خۆی و کۆمەڵ و سیاسەت و خاك ونیشتمان و سامانی نەتەوایەتی‌یەوە هەیە ، وەکو : پیرەمێرد ، بێکەس ، دڵدار ، گۆران ، جیگەرخوێن ، هێمن ، کامەران ، هەردی ، دیلان ، دلزار ، کاکەی فلاح ، هاوار ، هەژار ، مەدهوش و هی‌تر . .

### شیعری کوردی لە ڕووی ناوەرۆکەوە

مێژووی هەزار ساڵەی پڕ شانازی‌ی ئەدەبی کوردی ، بەرهەمێکی جوان و بەرز و نایاب و ڕەسەنی هەمە جۆر و ڕەنگاو ڕەنگی لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە تا سەردەمی تازە کردنەوەی ئەدەبی خستۆتە ناو لاپەڕەی تۆماری ووشەی نەمرەوە . بەرهەمی ئەدەبی کوردی ڕەنجی دڵسوزی‌و هەست و نەستی ناوەوەی شاعیرانی سەدان ساڵی دووایی‌یە . ئەدەبی نەنووسراوی میللی کارێکی گەورەی کردۆتە سەر بەرهەمی ئەدەبی کلاسیکی‌ی نووسراوەوە .

جوگرافیای خاکی کوردەواری‌وبەسەرهاتی سیاسی ی پڕ لە تەنگو چەڵەمەی کۆمەڵی کورد ناچاری کردبوو سەدان ساڵ لە ناو ئیمپراتۆریەتە گەورەکان بە پارچە کراوی بژێتەوە ، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بەرهەمی ئەدەبی کوردی بکەوێتە ژێر کاری ڕێزە وو گۆڕانێکی تایبەتی ، وە لە دووا جارا بووە هۆی ئەوەی شێوەو سیمایێکی تایبەتی وەربگرێ ، لە ئەنجام دا بەرهەمی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتە سەرەکی‌یەکانی زمانی کوردی بە درێژایی ڕۆژگار کەوتە ناوەوە . لەگەڵ ئەوەش‌دا

هەندێ جار تووشی بەرهەمی ئەدەبی وا دەبین کە ئەدگاری دیالێکتە بچووك و ناوچەیی‌یەکانیشی پێوە دیارە ، بەڵام بە زۆری بەرهەمی هەزار ساڵەی تەمەنی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەکو لوڕی ، گۆرانی ، کرمانجی (سەروو و خواروو) بووە .

ڕێڕە و گۆرانی ئەدەبی کوردی لەو ناوچەیەی دیالێکتی تایبەتی زمانی کوردی تێدا باو بوو ، قاڵب و شێوەی خۆی هەبوو ، لە ماوەی چەند سەدەیێك ، ئەدەبی هەر ناوچەیێك ، ڕەنگدانەوەی خاسیەتەکانی ناوچەکە بوو . لە بەر ئەوەی ئەدەبەکە هەر یەك ئەدەب بوو و لە یەك سەرچاوەی گشتی‌یەوە هەڵقوڵابوو ، پارێزگاری‌ی خۆی کرد . جیاوازی‌یەکەش بە چاکە گەڕایەوە ، چونکە بووە هۆی ئەوەی بابەتی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕوخساری جۆراوجۆر و ناوەرۆکی هەمە بابەت لە ئەدەبی کوردی‌دا پەیدا بێ . هەر دیالیکتێك لەم دیالێکتانە تاقی کردنەوەی هونەری خۆی هێنایە ناو ئەدەبی گشتی‌ی نەتەوەی کوردەوە ، بەمە دەوڵەمەندتر و بە پێزتر بوو .

بەر هەمی ئەدەبی کوردی لە ڕووی ناوەرکەوە لە تێکڕای دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکرێ بە دوو بەشەوە .

١ - لیریك

٢ - ئیپك (ئیپۆس) .

## لیریك

لیریك پارچە شیعرێکی کورتە لە مەبەسەکانی دڵداری و جوانی و سرووشت و ژیانی کۆمەڵایەتی - سیاسی و دانایی و ئایین و فەلسەفەو سۆفیزم و بزووتنەوەی دەروونی ئادەمزادو ناوەرۆکی تر دەدوێ ، بە زۆری جێگە و سەردەم و بزووتنەوە و قارەمانی زۆری تێدا نی‌یە ، لە بنەرەت‌دا لە کۆنەوە بۆ مەبەسی گۆرانی دادەنرا .

لە ئەدەبی کوردی‌دا لیریك دەکرێ بە دوو بەشەوە : (١) شیعری لیریکی خۆماڵی (٢) شیعری لیریکی ئیسلامی .

١ - شیعری لیریکی خۆماڵی : لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەر یەکێکە لەگەڵ لیریکی ئیسلامی ، تەنیا لە ڕووی ڕوخسارەوە لی‌ی جیا دەبێتەوە ، بەوەی لیریکی خۆماڵی لە سەر کێشی سیلاب دەهۆنرێتەوە بایەخێکی زۆریش بە یەکێتی قافیە نادرێ . هەروەها وشە و ڕستە و تەعبیری لیریکی ئیسلامی تێدا بەکار ناهێنرێ . ئەم لیریکە خۆماڵی‌یە تایبەتی‌یە بە دیالێکتەکانی لوڕی و گۆرانی و کرمانجی‌ی سەروو ، لە دیالێکتی کرمانجی‌ی خوارووودا نایێنرێ ، لە ئەدەبی فۆلکلۆری دا نەبێ .

ئەوەی جێگەی سرنج ڕاکێشانە ئەوەیە لیریکی خۆماڵی لە زمانی ستانداردی خەڵکی کوردەوە نزیکە لەبەر ئەوە دەشێ «شیعری میللی» شی پێ بڵێین . زیاتر شاعیران ئەم شێوەیان گرتووە بۆ ئەوەی دەنگی خۆیان بگەیێنە زۆربەی خەڵکی . ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی قوتابخانەی نالیش پەیدا بوو ، نوێنەری ئەم ڕێڕەوە حاجی قادری کۆیی بوو لە بەشی میللی‌ی شیعرەکانی ، لە پاشان شێوازەکە بۆ مەبەسی سیاسی - کۆمەڵایەتی لە لایەن شاعیرانی کوردەوە بەکار هێنرا تا دوایی جەنگی یەکەمی گیتیش .

٢ - شیعری لیریکی ئیسلامی : ئەم جۆرە شیعرە لە ڕووی ناوەرۆکەوە لەم بابەتانە پێك دێ :

(١) پاڕانەوە (موناجات = ئیلاهیات) : بە زۆری لە شێوەی قەسیدەدا دەبێ ، ناوەرۆکی بریتی‌یە لە پاڕانەوە لە خودا و وەسف کردنی گەورەیی و توانایی لەبەر ڕۆشنایی بیرو باوەڕی ئایینی ئیسلام . لە گەڵێ شتدا لەگەڵ شیعری ئایینی عەرەبی یەکتری دەگرنەوە . سەرچاوەی ئەم جۆرە شیعرە قورئان و شەریعەتی ئیسلامی‌یە ، شاعیر پشت بە ئایەتی قورئان دەبەستێ و وەکو خۆی وەری دەگرێ و هەر بە زمانی عەرەبی لەگەڵ ڕستەکانی شیعرەکە تێکهەڵکێشیان دەکا . زمانی ئەم جۆرە شیعرە تێکەڵە ، شاعیر ووشە و زاراوەی عەرەبی ئایینی زۆر بەکار دێنێ .

(٢) نەعت «پێدا هەڵدان و پاڕانەوە لە پێغەمبەر»

ئەم جۆرە شیعرە لە هەموو ڕوویێکەوە وەکو موناجات وایە ، بەڵام تایبەتی‌یە بۆ پێغەمبەر ، لێرەدا زیاد لە قورئان و ئەدەبیاتی ئایینی شاعیر بە زۆری حەدیسی پێغەمبەریش تێکهەڵکێش دەکا . گەلێ جار قەسیدەی موناجات و نەعت تێکەڵ بە یەکتری دەبن و بەرهەمەکە بۆ هەر دوو مەبەس دەست دەدا ، چونکە بە ڕاستیش هەر یەکەیان ئەویتر تەواو دەکا ، بە تایبەتی قەسیدەی نەعت ناکرێ لە موناجات جیا بکرێتەوە ، زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی‌ی کورد لەم هونەرەیان هەیە .

(٣) **غەزەل** : بەو شیعرە دەووترێ کە ناوەرۆکەکەی لە بابەت دلداری و ئەڤین و خۆشەویستی و دەسبازی و ماچ و مووچ و بەزم ڕەزمی ژنانەوەیە. شاعیر لە غەزەل‌دا وەسفی لەش ولارو خوو و ڕەووشت و جوانی و نازەنینی ژنان دەکا . لە کۆنا ناوەرۆکی غەزەل دەکرا بە پێشەکی بۆ هەموو بابەتەکانی شیعری لیریکی ، بەڵام لە دووایی‌دا «غەزەل» بوو بە مەبەسێکی تایبەتی‌ی سەربەخۆ لە ئەدەبی هەموو نەتەوە موسوڵمانەکان‌دا .

ئەگەرچی لە بنچ‌دا غەزەل هەست ونەستێکە بەرامبەر بە مێینە بەڵام لە ئەدەب‌دا لە ڕۆژگارانی گوڕرانی دا غەزەلی نێرینەش پەیدا بوو . ئەم بابەتی بەرهەمە لە ئەدەبی کوردی‌دا کەمە ، زیاتریش وەسف کردنی کوڕ و نواندنی دلداری و خۆشەویستی و سۆز بەرامبەر بە نێرینە لە بەرگێکی سۆفیزمیانە جێگەی خۆی لە شیعری کوردی‌دا کردۆتەوە .

هەندێ جار ئەم دوو بابەتە ، واتە غەزەلی کوڕ و غەزەلی کچ تێکەل بە یەکتری دەبن و گێتی‌یێکی سۆفیزم دروست دەکەن . جاری واش هەیە هەر دوو «غەزەل»ەکە بە «عەشق» دەزانی و زاراوەی «عەشقی حەقیقی» و «عەشقی مەجازی» بەکار دێنن .

غەزەلی سۆفیزم بریتی‌یە لە تەم و مژێکی گیانی ، سۆز و خۆشەویستی‌یێکی ئەوەتۆی دروست کردووە ، هەندێ جار وا دەزانی ئەم خۆشەویستە کوڕە ،

هەندێ جاریش دا دەزانی کچە ، جاری تریش تێکەڵ بە یەکتری دەبن و نە کوڕە و نە کچە ، ئەمە لای ئەوان «موتلەق» ە خۆی لە کردگاردا دەنوێنێ . جاری هەیە غەزەل (خۆشەویستی) لە نێوان سۆفیزم و دڵداریی ڕاستیدا دەوەستێ .

٤) وەسف :

وەسف بۆ مەبەسی وێنە گرتنی دلبەر لە ڕووی جوانیی ئەندامی لەشیەوە بەکار دەهێنرێ . هەروەها باس کردن و کێشانی دیمەنی سرووشت جێگەیێکی دیاری لە هونەری وەسفدا هەیە . جگە لەوە وەسف خەریکی هەموو ڕووداوەکانی سرووشتە وەکو ئاژاڵ و زیندەوەر و ڕووەك . بۆ جەنگ و سووارچاکیش بەکار دەهێنرێ . لە بەر ئەوەی وەسفی ئەم بابەتە ڕووداوانە ، واتە جەنگ و سووارچاکی و شەڕ و شۆڕ پێویستیی بە پشووی درێژ هەیە شیعرەکە نە هەزدە دێرە شیعر تێپەر دەبێ ودەبێتە قەسیدە .

ئەم مەبەسە بێ گومان لەگەڵ شیعری دڵداری تێکەڵ دەبێ بە تایبەتی ئەگەر شیعرەکە پێوەندیی بە وەسفی جوانیی یارەوە هەبێ .

(٥) پێداهەڵدان (مەدح) :

ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە بریتییە لە پێداهەڵدان و دەرخستن و پیشان دانی خوو و ڕەووشتی چاك لەو کەسەی کە شیعرەکەی بۆ دادەنرێ .

لەم جۆرە شیعرەدا تەنیا کردەوەی باشی ئادەمزاد وەردەگیرێ و کردەوەی خراپ پشت گوێ دەخرێ . دیارە مەرجیش نییە ئەو کەسەی مەدح دەکرێ خاوەنی ئەو ڕەووشت و کردەوە چاکانە بێ کە شاعیر بۆی هەڵدەبەستێ بە زۆری ئەم جۆرە شیعرە لە خووارەوە بۆ سەرەوە دەبێ ، واتە کەسی بێ دەسەڵات ئەم بابەتە شیعرە دادەنێ بۆ کەسی زەبر بە دەست بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێ . هەندێ جاریش لە باوەڕەوە شاعیر مەدحی گەورەییەك یا زانایێك یا داهێنەرێك دەکا کە شایانی ئەو مەدحەیە .

(٦) شانازی (فەخر)

شاعیر لەم جۆرە شیعرەدا خۆی یا بنەماڵەی یا هۆز و عەشیرەتی وەکو شتێکی دیار و پایەدار لە ناو کۆمەڵدا پیشان دەدا ، ئەم جۆرە شیعرە پێوەندی بە توانایی شاعیریەتێکی بەرزەوە هەیە . هەروەها دەبێ هەست ونەستێکی قووڵیشی تێدا بێ ، بە تایبەتی دۆزینەوەی کەرەستە بۆ بەراوورد کردن ، زمانی ئەم بابەتە شیعرە سفت و بەهێز دەبێ . هەندێ جاریش لە شانازیی خۆ و بنەماڵە دەچێتە دەرەوە و خەریکی مێژوو و بە سەرهاتی نەتەوە دەبێ ، وەکو شانازی کردن بە قارەمان و گەورە پیاو و کار بەدەست و زانا و داهێنەرو شاعیر و هونەرومەری نەتەوە .

(٧) ماتەمنامە (مرثیە = مەرسیە)

ئەم جۆرە شیعرە وەکو پێداهەڵدان (مەدح) وایە ، بەڵام بۆ مردوو بەکار دەهێنرێ ، هەندێ جاریش شاعیر پێش مردنی خۆی ماتەمنامە بۆ خۆی دادەنێ ، کە بێ گومان دەبێ بە وەسیەتنامەیێك ، ماتەمنامە نایابەکەی مستەفا بەگی کوردی لەم بابەتەیە .

(٨) ڕیسوا کردن (هەجو)

ئەم جۆرە شیعرە پێچەوانەی پێداهەڵدانە ، واتە دەرخستن یا دروست کردنی خوو و ڕەووشتی خراپ بۆ ئەو کەسەی ڕیسوا دەکرێ ، شاعیر لەم بابەتە شیعرەدا مەسەلە گەورە دەکا و ووشەو ڕستەی جنێوکاری بەکار دەهێنێ . دیارە ڕیسوا کردن ناچێتە ناو ڕەخنەوە ، بەڵام بە هەموو جۆری ووردەکاری جووانکاری «ئیستێتیکی) تێدا یە .

(٩) شیعری کراوە (مەکشووف)

شیعری کراوە بۆ بەڵگەی باس کردن و دەرخستنی شتومەکی شارراوەی ژن و پیاو بە ئاشکرا بەکار دەهێنرێ ، لەبەر ئەوەی لە ناو کۆمەڵدا باس کردنی ئەم جۆرە شتانە شەرمە ، بەم جۆرە شیعری کراوە خۆی دەبێ بە ڕیسوا کردن (هەجو) . لە ئەدەبی کوردیدا ئەم جۆرە شیعرە بۆ گەڵی مەبەس بەکار دەهێنرێ . بێ گومان لە کاتێکدا دروست دەبێ کە دوو بیر و ڕا بە پێچەوانەی یەکتری دەبن و دژ بە یەك دەوەستن .

بەشێکی زۆر لە شیعری کراوەی کوردی هیچ پێوەندییێکی بە ڕیسوا کردنەوە نییە ، ووردو جوان و هێمن و لەسەرخۆ شاعیری کورد توانیویەتی وێنەی هونەری بەرز بنوێنێ لەم بابەتە شیعرەدا ، بۆ وێنە شیعرە ڕۆمانتیکی بە کراوەکەی «مەستوورە کە حەسناو ئەدیبە بە حیسابی» ی نالی ، یا پێنجینەکەی ئەدەب بۆ نەسرەت خانمی ژنی «دوێ شەو شەوی شەمبە . .» بەڵام بە زۆری لای شێخ ڕەزا بۆ مەبەسی جنێو و ڕیسوا کردن بەکار دەهێنرێ . وە ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە لە لای شێخ ڕەزا ئەگەرچی وێنەکانی هونەروەرانە داڕێژراوون و هەندێ جاریش تابلۆی کاریکاتێری زۆر جوان دەکێشی بەڵام ئەندامی شارراوەی ژن و پیاو تێکەڵ بە یەکتری دەکا ، بە تایبەتی زووریش خەریکی هەتیو بازییە چونکە لە کۆمەڵی کوردەواری دا ئەو کوڕەی بە هەر هۆیێك خراپ بکرێ هەتا مردن چاو شۆڕ دەبێ . لە لای شێخ ڕەزا بە زۆری شیعری ڕیسوا کردن و شیعری کراوە تێکهەڵکیش کراوون و بۆ یەك ئامانج بەکار هێنراوون .

لیریك

ئیپیك (ئیپۆس) ڕووداو چیرۆکە بە شیعر دەهۆنرێتەوە . بە زۆری ناوەرۆکی لە ئیپۆسی فۆلکلۆری وەردەگرێ ، بەڵام شاعیری کورد بەو دەسکاری و داهێنانەی

که تێیدا خەرج دەکا ، بەرهەمێکی ڕەسەنی تازەی تۆمارکراو دێنێتە ناو ئەدەبی کوردییەوە ، ئیتر زۆربەی ئەم بەرهەمە شیعری درێژی دڵداریی ڕۆمانتیکییانەیە لە بارەی سووار چاکی و قارەمانی و ڕاوو شکار و شەڕ و شۆڕەوەیە .

ئێمە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێ بە دوو بەشەوە : ١ – بەیت ٢ – چیرۆکی شیعری .

١ – بەیت : وەکو بابەتێکی چیرۆکی شیعری زیاتر بۆ مەبەسی گۆرانی چڕین دادەنرێ ، خەریکی دڵداری و خۆشەویستی و سرووشتە ، هەروەها ڕووداوی مێژووی قارەمانیەتی و پاڵەوانیی نەتەوە لە شۆڕش وجەنگ و بەرگری لە نیشتمان دەگرێتەوە . لەم جۆرە شیعرە «بەیتی مێرانی» شی پێ دەڵێن .

ئەدەبی کوردی کلاسیکی بە تایبەتی ئەدەبی دیالێکتی کرمانجیی سەروو بەرهەمی نایابی لەم بابەتەمان بۆ دەور دەکاتەوە ، وەکو بەیتەکانی فەقێی تەیران «شێخی سەنعان» و «بەیتی فەقێ تەیران بەر ئاڤێرا خەبەر دایە» ، بەرهەمی بە ناوبانگی مەلای باتەیی «زەمبیل فرۆش» و هیتر .

٢ – **چیرۆکی شیعری** : چیرۆکی شیعری داستان و مەلحەمە و مەسنەویشی پێ دەڵێن ، لە دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجیی سەروو باو بووە و بەرهەمێکی زۆر لەم بابەتەوە کەوتۆتە ناوەوە . ئەم جۆرە شیعرە پێوەندی ێکی ڕاستەوخۆی بە میللەتەوە هەیە ، هونەرێکی ڕەسەنی خۆماڵییە ، ناوەڕۆکی لە حیکایەتی بەر گوێی ئاگردان و گێڕانەوەو تاق کردنەوەی پێشینان وەردەگرێ ، بەسەرهات و سەرو سەر بردەی قارەمانان وبنەماڵەو هۆز و عەشیرەتی کورد لە پێشانا دەبێ بە هەوێنی شیعری فۆلکلۆری ، ئنجا ئەم بەرهەمە فۆلکلۆرییە دەبێتە سەرچاوە بۆ چیرۆکی شیعری تۆمار کراو . ئەگەر ناوەڕۆکی هەندێ چیرۆکی شیعری کوردی لەگەڵ چیرۆکی شیعری نەتەوە هاوسێکان یەکتری بگرنەوە ، لەبەر ئەوەیە سەرچاوەی هەموویان یەکێکە ، جگە لەوە سەرچاوەی ئایینیش بە تایبەتی لە ڕووی سۆفیزمییەوە کاری بە سەر چیرۆکی شیعری کوردیدا هەیە . هەروەها ناوەڕۆکی حیکایەتی ئایینیی سامیی کۆن ، حیکایەتی عەرەبیش جێی خۆیان لە ناو چیرۆکی کوردی کردۆتەوە ، ئەم ناوەڕۆکە بێگانانە بە ڕاستی ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەند کردووە ، چونکە وەستایانە لە لایەن شاعیرانی کوردەوە وەرگێڕاوون و ئەدگاری کۆنیان ون کردووەو بوون بە کوردی چونکە ڕووداوەکان بە جەوهەرێکی کوردی دوو بارە خراونەتە ڕوو .

بەم جۆرە لە ڕووی سەرچاوە و ناوەڕۆکەوە دەتوانین چیرۆکی شیعری کوردی بە سەر سێ بەشدا دابەش بکەین :

(١) ناوەڕۆك و سەرچاوەی سامی و عەرەبی :

لە پێشانا ئایینی کۆنی سامییەکان ، ئنجا کتێبی پیرۆز و قورئان بوون بە سەرچاوە بۆ نووسینەوەی چیرۆکی شیعری لە ناو نەتەوە موسوڵمانەکاندا لە پاش داهاتنی ئایینی ئیسلام . بێ گومان کوردیش بەشداریی لەم کارەدا کردووە ، ئەمە بە ئاشکرا لە چیرۆکی شیعری «یووسف و زولەیخا» دا دەر دەکەوێ . ئەدەبی کوردی دوو بەرهەمی لەم بابەتەمان بۆ دەور دەکاتەوە ، یەکەمیان «یووسف و زولەیخا» ی سەلیمی سلێمان (سەدەی حەڤدەم) ، دووەمیان «یووسف و زولەیخا» ی حاریسی بدلیسی (سەدەی هەژدەم) .

لە سەرچاوە عەرەبییەکان ڕووداوی دڵداریی لەیلا و مەجنوون دەورێکی باڵای لە چیرۆکی شیعری کوردیدا هەیە ، بە درێژایی ڕۆژگار شاعیر و نووسەرانی کورد بایەخیان بە چیرۆکی میللی لەیلا و مەجنوون داوە . بەم ڕەنگە گەلێ تێکستی جۆراوجۆری ئەم چیرۆکە کەوتۆتە ناوەوە ، لەمانە «لەیلاو مەجنوون»ی مەلا محەمەدی قولیی کەندوولەیی لە ساڵی ١٧٣٢ لە نووسینەوەی بۆتەوە ، «لەیلا و مەجنوون» ی حاریسی بدلیسی لە ساڵی ١٧٥٨ تەواوی کردووە ، «لەیلا ومەجنوون»ی میرزا شەفیعی جامەڕێزی کولیایی (سەدەی نۆزدەم) «لەیلا و مەجنوون»ی مەلامە مەحموودی بایەزیدی ، بە پەخشان دایناوە لە ١٨٥٨ تەواوی کردووە «لەیلا و مەجنوون» ی مەلا وەلەد خان (سەدەی نۆزدەم) .

جگە لەمانە حیکایەتی غەزای پێغەمبەرو ئەسحابە و فەرماندە بەراییەکانی ئیسلام ڕەنگیان لە چیرۆکی کوردی داوەتەوە ، بۆ وێنە غەزا و بەسەرهاتی محەمەدی حەنیفە لە چیرۆکی شیعری کوردیدا جێگەی دیاری هەیە .

هەروەها بەرهەمێکی یەکجار زۆری ئەدەبی کوردیش لە ناوەوەیە لە بابەت مێژووی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرەوە ، لە ئەدەبی کوردی و لە ناو خەڵکدا بە «مەولوودنامە» ناوی دەرکردووە .

**٢ – ناوەڕۆك و سەرچاوەی کۆنی خۆماڵیی پێش ئیسلام :**

ئەمە بریتییە لە هەموو حیکایەت و بەسەرهات و داستان و ئەفسانە و گێڕانەوە هەرە کۆنەکانی کە دەگەڕێنەوە پێش ئیسلام ، واتە سەردەمی کۆچی هیندو ئەورووپی و نیشتەجێ بوونی هیندۆئێرانییەکان بە تایبەتی سەدەمی هەزار ساڵەی پێش ئیسلام . لەمانە بۆ بەڵگە «شیرین و فەرهاد» یا «شیرین وخوسرەو»ی خانای قوبادی (سەدەی هەژدەم) ، «جیهان گیر و ڕۆستەم»ی میرزا شەفیعی جامەڕێزی (سەدەی هەژدەم) ، «بارام و گوڵەندام»ی شاعیری نەناسراوی کوردی سەدەی نۆزدەم و گەلێکی تریش .

دیارە ناوەڕۆکی هەموو ئەم چیرۆکە شیعری یانە تەنیا خەریکی سەردەمی پێش ئیسلام نییە ، بەڵکو هی پاش ئیسلامیشیان تێدایە ، وەکو «شەڕی نادر شا»ی میرزا شەفیعی جامەڕێزی .

**٣ – ناوەڕۆك و سەرچاوەی کوردی**

ئەم بابەتە چیرۆکی شیعرییە ناوەڕۆکی لە گێڕانەوە و حیکایەت و بەیتی فۆلکلۆری میللییەوە وەردەگرێ . واتە ڕووداوەکانی تایبەتین بە کۆمەڵی کورد و قارەمانەکانی کوردن . ڕەنگدانەوەی ئامانج و ئاواتی میللەتن لەو ڕۆژگاری، کە شاعیری میللی یا کلاسیکی ڕووداوەکان دەخاتە قاڵبی «چیرۆکی شیعری» یەوە . شاکاری گەورەی ئەدەبی نەتەوەی کورد «مەم وزین» ی خانی لەم جۆرە بەرهەمەیە .

●

# نهێنی‌یەکانی هۆنراوە

د. عبدالله دەبباغ
کۆلێجی ئەدەبیات - زانکۆی سەلاحەددین

ـە کاتی ووتنەوەی هۆنراوەی ئینگلیزی سەدەی نۆزدەهەم و ـەی بیستەم و رەخنەی پراکتیکی لە پلە ماجستێری بەشی ـی بۆ ماوەی چەنــد ساڵێـك زۆر جار سەرنـجم بۆ ئەوە ـ مکێشرا کەوا زۆربـەی هۆنـراوە، بەتایبەتی هەڵبەستەکانی ـیعری تازە، نەخشەیەکی تایبەتی شاراوە، یاخود بە ئاسانی ـراویـان هەیە، کە وەکو کلیلێك لە دوای ووردبوونەوە لە ـەبـەستـەکـە نهێنی‌یـەکانی فۆرم و (واتایشمان بۆ ئاشکرا ـ ـکـ و تێگەیشتنمان بۆ هونەری هۆنراوە قووڵترو دەوڵەمەندتر ـ مکـات. ئەو بەردە بنـاغـەیـە، دەم و دەست نەبینـراوەی، ـراومکـە لەسـەری دامەزراوە لە وانەیە لە بیناو دارشتنی ـەـستـەکـە بێت یا لەو ئامـرازە شیعـری‌یانە بێت کە بە ـیوەیـەکی تایبەتی بەکاریان دەهێنێت یا لە زمان یا لە واتا ـیکری‌یەکە یا لە وێنەی شیعری یا لەهەر لایەنێك لە لایەنەکانی ـۆراوە بێت کە شاعیر هەڵی دەبژێرێت.

ـۆر جاریش، بەتـایبـەتی لە هۆنــراوەی شاکـاری هەرە ـەرکـەوتوو، ئەو ئامرازە شیعری‌یە یا ئەو جۆرە تایبەتی‌یەی ـەکارهێنان و یاری‌کردنە بە زمان یا ئەو جۆرە پێشکەش کردنەی ـیـەکی فیکـری تایبـەتی تەنهـا شێـوازە گشتی‌یـەکـەی ـەڵبەستەکەی لەسەر دامەزراوە ناگرێتەوە، بەڵکو هۆنراوەتەوە ـو هەموو یا زۆر لە بەشەکانی هەڵبەستەکەو دۆزینەوەی ئەو هەمـو دەنگـدانـەوەی دارشتنـە بتـەرەتی‌یـەکـە خۆشی‌یەکو قووڵی‌یەکی ئەستاتیکی (Aesthetic) تایبەتی دروست دەکات.

بۆ نموونە سەیری ئەو هەڵبەستە کارتێکەرەی گۆران بکە:

## ڕۆڵەی بێ دایك

نە ئاخ لە سینەدا ئەخواتەوە پەنگ،
نە فرمێسك ئەتوانێ بڕژێ بە بێ دەنگ

نە زمان ئەوەستێ لەمە زیاتر،
نە قەڵەم وەك لاشەی مردووی ساردوسڕ..

نەفام لە جێگای خۆی ئەمێنێ،نە هۆش،
دیمەنێ من بینیم بەرد دێنێتە جۆش..

کێ دایکێ ئەتوانێ بێنێتە بەر چاو،
بە مەرگی تاقانەی جەرگی هەڵقرچاو،

دامابێ لە دەشتێ، هاواری بە کەس
نەکا هیچ.. هەر خۆی بێ‌و مەیتی کوڕی بەس!.

**ئا، سەیری دیمەنی وەها کاریگەر**
**کام ویجدان ناداتە بەر نووکی نەشتەر؟!**

**بەڵام ئاخ، ئەوەی من دیم بەم دوو چاوە**
**مەینەتێکی سووکە ئەمەی بەلاوە:**

**نەک دایکی کور مردوو، دیم کۆرپەی ساوا**
**لای مەیتی دایکیا، فرمێسک لەچاوا،**

**کەتبوو بە بێ شیر، بێ لاوانەوە،**
**ناو جەرگی ئینسانی ئەچووزانەوە!.. (١)**

زۆر بە ئاشکرایی کلیل و روونکردنەوەی واتای ئەم هەڵبەستە لە بیناو دارشتنەکەیەتی، کە بە هەمان روونی‌یەوە ئەکرێ بە سێ بەشی جیاواز و هەر یەکەیـان بریتی‌یە لە سێ کۆپلە (لێرەدا مەبەست لە کۆپلە، وەکو ووشەی (Couplet)ی ئینگلیزی، دوو دێر (بە واتای (line)ی شیعرە). سێ کۆپلە یەکەم رۆڵی پێشەکی دەبینن و خوێنەر بۆ دیمەن و مەبەستی سەرەکی هەڵبەستەکە ئامادە ئەکەن.

ئامرازە شیعری‌یە سەرەکی‌یەکەی ئەو سێ کۆپلەیەش زیادە رۆیی (مبالغە) (Hyperbole) یە: نیە دیمەن، شاعیر ئەڵێت، کاریگەرتر و بە ئازارتر لەو دیمەنەی من بینیومە. لەناو خۆشیاندا، ئەوا سێ کۆپلەیە، لە رووی رێزمانەوە، بەستراون بە یەکەوە بە رێگای دووبارە کردنەوەی هەمان فۆرمی زیادە رۆیی لە پێنج دێری یەکەم (نە ئاخ، نە فرمێسک، نە زمان، نەقەڵەم، نەفام)و وەڵامدانەوەیان لە دێری شەشەم دا بە دەست راکێشان بۆ بابەتی سەرەکی هەڵبەستەکە.

هەروەها سێ کۆپلەی دووەمیش بە یەکەوە بەستراون و لەناو خۆیاندا یەکێتیەکی ئاشکرای دیاریکراو دروست دەکەن، لە رووی دارشتنەوە هەر سێ کۆپلە بریتین لە یەک پرسیار (یاخود دو پرسیار)ی لەو جۆرە پرسیارانەی پێیان دەووترێ پرسیاری رەوانبێژی (Rhetorical Question) کەواتە پرسیاری وەڵام لە سەرەتادا زانراو. مەبەستی شاعیر لێرەدا، لەم پرسیارە، ئەوەیە بڵێت کەس ناتوانێ بەرامبەر دیمەنی دایکێکی جەرگ سووتاوی بێ دەسەڵات بە دیار مەیتی تاقانەوە دانیشتوو بوەستێت یاخود ئازارێکی لەوە کاریگەرتری بە خەیاڵ دا بێت. لەو سێ کۆپلەیەدا گۆرینێکی بنەرەتی لە دارشتندا هەیە (لە شێوەی رستە ئاسایی‌یەکانی بەشی یەکەم بۆ شێوەی پرسیاری بەشی دووەم)، بەڵام لە هەمان کاتدا ئامرازە شیعری‌یە سەرەکی‌یەکەی زیادە رۆیی بەشی یەکەم لێرەدا هەر بەردەوامە.

لە رووی واتاشەوە، هەر چەندە ئەو سێ کۆپلەیەی ناوەراست تەواوکەری سێ کۆپلەکەی یەکەمن چونکە بە درێژی باسی ئەو دیمەنە دەکەن کە دێری کۆتایی بەشی یەکەم دەستی بۆ راکێشابو، شتێکی تازە لێرەدا دەست پێ دەکات و بە باسکردنی ئەو دیمەنە لەوە دەچێت شاعیر بابەتی سەرەکی هەڵبەستەکەی لێرەدا پێشکەش خوێنەران بکات. بەڵام، بە ووردەکاریەکی هونەریی وەستایانە، گۆران لە سێ کۆپلەی کۆتایی‌دا هەمو رێرەوی هەڵبەستەکە دەگۆرێت و بەرەو ئەنجامێکی تری لە خەیاڵ دا نەبوو دەبیات. سێ کۆپلەکەی ناوەراست و وێنە ئازاراوی یەکەی دایکی جەرگ سووتاو کە هەڵبەستەکە لەوە ئەچوو لە دەوروبەریاندا، وەکو بەشێکی سەرەکی، بخولێتەوە، ئێستا بۆمان دەردەکەوێت تەنها رێگا خۆشکەرێك بوون بۆ ئەنجامێك و دیمەنێکی تاڵتر و ئازاراوی‌تر.

هەڵبەستەکە، لەراستیدا، دەربارەی دایکی جەرگ سووتاو نیە بەڵام دەربارەی، هەر وەکو ئێستا دێتەوە یادمان ناونیشانەکەی پێشتر تۆماری کردبو، (رۆڵەی بێ دایك)ە. بەو «فێڵە» شیعری‌یە گۆران زۆر سەرکەوتووانە سوود لە بەراووردکردنی ئەو دو وێنە ئازاراوی‌یە وەردەگرێت بۆ دوپاتکردنەوەی مەینەتی دیمەنی سەرەکی‌یەکەی. لێرەدا تەکنیکەکە کت و مت وەکو ئەوە وایە، لە پارچەیەکی مۆسیقادا، ئاوازێکی سەرەکی بکشێتەوە دواوە رێگا خۆش بکات بۆ ئاوازێکی کاریگەرتری سەرەکی‌تر.

ئەو گۆرینە بیر لێنەکراوە کت و پرە خۆشی‌یەکی ئەستاتیکی تایبەتی بە خوێنەر ئەبەخشێ، لە هەمان کاتدا کە بیناو دارشتنی هەڵبەستەکە تەواو دەکات و فۆرمی تایبەتی هۆنراوەکە بە گشتی دروست دەکات.

**له كاتی لێدوان له بەشە جیاوازەكانی دارشتنی فۆرمی گشتی ئەو جۆرە هەڵبەستە، و زۆر جار هۆنراوە بە تێكرا، ناچار ئەبین پەنا بەرینە بەر زاراوەی مۆسیقایی وەكو بزووتنەوە جیاوازەكانی پارچەیەكی سیمفۆنی. بێگومان هەروەها بەراوردكردنی دارشتنی ئەو هەڵبەستەی گۆران لەگەڵ بەشە جیاوازەكانی بەرهەمێكی درامایی، یاخود بەرهەمێكی گێرانەوە (سرد) (Narrative)، كە بریتیین له پێشەكی و ئاڵۆزكردن و ئەنجام زۆر بەسوودو بەجێیە.**

له كۆتاییدا، و پێش ئەوەی ئەو هەڵبەستە بۆ هەڵبەستێكی‌تر جێ بهێڵین، پێویستە سەرنجی هێندێك وردەكاری لاوەكی‌تر بدەین كە ئەو دارشتنە گشتی‌یەمان زیاتر بۆ روون دەكەنەوە. بۆ نموونە سێ كۆپلەی بزووتنەوەی یەكەمی هەڵبەستەكە. راستە، هەر وەكو له پێشدا وتمان، ئەو كۆپلانە رۆڵی پێشەكی دەبینن و تا دێری شەشەمیان هیچ جۆرە پێوەندیەكی راستەوخۆیان بە وێنە سەرەكی‌یەكەی هەڵبەستەكە نیە، بەڵام، ئەگەر سەرنجی وێنەكانی ئەو بەشە بدەین (نەمانی هەناسە، بێ دەنگی، وەستانی زمان، وشك بوونی قەڵەم و نەمانی فام و هۆش) ئەبینین گۆران چەند زیرەكانە بە رێگای ناراستەوخۆی وێنەی شیعری‌یەوە ئێمەی بۆ دیمەنە سەرەكی‌یە ئازاراویەكەی مەرگ ئامادەكردووە بە تایبەتی له لێك چواندنە (تشبیە) (Simile) ) داچلەكێنەكەی دێری. چوارەم: نە قەڵەم وەك لاشەی مردووی ساردوسر.. وەكو ئەوە وایە ئەم وێنانە بیانەوێ كار له ناهەستی (لاشعور) خوێنەر بكەن و بە رێگای ئەوەوە گەورەترین كاریگەری بۆ بەشەكانی‌تری هەڵبەستەكە مسۆگەر بكەن.

له راستیدا هەمو وشەو وێنەكانی ئەو بزووتنەوەد سەرەتایی‌یەی هەڵبەستەكە دەربارەی مردن و ژیانن و رێگا خۆش ئەكەن بۆ ئەو دیمەنەی ئەوەندە كارتێكەرە كە زیندوو له جێگای خۆی وەك مردوو لێ دەكات یان مردوو ئەهێنێتە بزووتن (بەرد دێنێتە جۆش).

هەروەها سەیری كە چۆن ئەو بەراوردكردن و دژواریەی (تضاد) (Antithesis) مردن و ژیان، یاخود مردوو و زیندوو، له بزووتنەوەی دووەمدا، شەكڵی تایبەتی كاریگەری دایكی بە مەرگی تاقانەی جەرگ سووتاو وەردەگرێت، و له دواییدا چۆن وەرگێرانی ئەو وێنەیە له بزووتنەوەی سێهەمی هەڵبەستەكەدا ئەو دژواریی‌یەی مردن و ژیان قووڵتر و تاڵتر دەكات. بە نەمانی دایكە داماوە جەرگ سووتاوەكە مەینەتی مناڵەكە، هەر چەندە ئێستا زیندووە، پتر دەبێت و سەركەوتنەكەی مەرگ بەسەر ژیاندا گەورەتر دەنوێنێت. له كۆتاییدا ئێستا تەنها مەرگ ئەمێنێتەوە، لەگەڵ شاعیر خۆی، بۆ گێرانەوەی ئەم كارەساتە دڵتەزێنە:

**بەڵام ئاخ، ئەوەی من دیم بەم دوو چاوە**
**مەینەتێكی سووكە ئەمەی بەلاوە:**

هەر ئەوەشە ئەمان گەیەنێتە دوا سەرنج دەربارەی ئەم پارچە هەڵبەستەی شێوەی دارشتنە گشتی‌یەكەی وەكو دارشتنێكی مۆسیقایی یاخود درامایی هاتە بەرچاومان. ئەم هەڵبەستە، كە بە دابەشكردنە ئاشكرایەكەی بۆ پێشەكی و ئاڵۆزكردن و ئەنجام له پیەسەكی شانۆگەریی دەچێت، له هەمان كاتدا، و له كاكڵەدا، گێرانەوەیە: شاعیر لێرەدا خۆی‌گێرەوەی بەسەرهات و دیمەنێكی كارەساتاویە، سەیری كە چۆن بەو كارە هەڵدەستێت. له بەشی یەكەمی هۆنراوەكەدا، گوێگر تەنها ئامادە ئەكات بۆ ئەو كارەساتەی لێرەدا ناهێڵێت هیچ شتێك دەربارەی بە شێوەیەكی راستەوخۆیانە بدركێندرێت، هەر چەندە بە شێوەی دارشتنی رستە (نە ئاخ، نە فرمێسك، نە زمان هتد)و بە وێنەی شیعری دڵتەزێنەوە (رژانی فرمێسك، وەستانی زمان و لاشەی مردووی ساردوسر) وا له گوێگر ئەكات چاوەروانی كارەساتێكی گەورە بێت. تەنها له بەشی دووەمی هۆنراوەكە وێنەیەكی سەرەكی پێشكەش دەكرێت بەڵام ئێستاو له دوای ئامادەكردنەكەی بەشی یەكەم، شاعیر دەتوانێ هەموو هێزو توندیی هەڵبەستەكە بخاتە ناو ئەو دیمەنەوەو، وەكو له زمانی سینەما پێی دەڵێن، بە شێوەی (CLose – up) (زۆر لەنزیكەوە) پێشكەش بكات و خۆی وەكو قسەكەر یاخود گێرەوە بە تەواوەتی لێ دەربهێنێت. تەنها له بەشی سێهەمیشدا، و له دوای ئەو وەرگێرانە هونەری‌یەی دیمەنی سەرەكی كە باسمان كرد، شاعیر دووبارە ئەگەرێتەوە ناو هۆنراوەكەو بە هەستی خودی خۆیەوە قسە دەكات، هەمو بەشەكانی هەڵبەستەكە بەیەكەوە

ده‌به‌ستێته‌وه‌و دووپاتی لایه‌نی ئینسانی دیمه‌نه‌ کاره‌ساتاوی‌یه‌که‌ ده‌کات.

هه‌ر چه‌نده‌ له‌وانه‌یه‌ هیچ هۆنراوه‌یه‌ك نه‌بێت به‌ بێ جۆره‌ بیناو دارشتنێکی تایبه‌تی، هه‌رچه‌نده‌ ئه‌و دارشتنه‌ سه‌ره‌تایی بێت، هیچ مه‌رج نیه‌ بینا یا دارشتن کلیلی هه‌مو هۆنراوه‌یه‌ك بێت. وه‌کو له‌ پێشدا ووتمان سیحری تایبه‌تی هه‌ر پارچه‌ هه‌ڵبه‌ستێك جیایه‌ له‌وی تر و له‌وانه‌یه‌ ئه‌و سیحره‌ له‌ ناو هه‌ر لایه‌نێك له‌ لایه‌نه‌کانی هونه‌ری هۆنراوه‌ خۆی شاردبێته‌وه‌، زمان بێت یا وێنه‌ی شیعری یابیر یا بیناو دارشتنی گشتی، بۆنموونه‌ یا ئێستا سه‌یری هه‌ڵبه‌سته‌ به‌ناوبانگه‌که‌ی ئه‌حمه‌د هه‌ردی،
۱ (رازی ته‌نیایی)، بکه‌ین:

**ژیان و ئه‌رکی ناخۆشی‌ی: په‌پوله‌ی ئارمزوی کوشتم**
**شه‌رابی جامی دڵداری، له‌ تاق لاوییا، رشتم! ته‌می رۆژانی**
**پر مه‌ینه‌ت، وه‌ها تاریك و چڵکن بوو نیگاری خۆشه‌ویستی**
**دڵ، په‌ری ئاسایی، تیا ون بوو! شه‌وی ته‌نیایی، رووناکی**
**چرای ئاواتی، خنکانم ده‌س ناکامی، ئاوازی ده‌رروونی**
**که‌یلی، تاسانم ئه‌وا ئێستا له‌گه‌ڵ زامی،**
**ده‌روونی پر له‌ ناکامی**
**ئه‌پێوم چۆڵی: سه‌رسامی**

★ ★ ★

**له‌ ته‌نیایی شه‌وی ژینا، ئه‌نێم هه‌نگاوی کوێرانه! نی‌یه‌**
**ده‌ستێ، ده‌رمبێنێ له‌ناو ئه‌م گۆره‌ وێرانه‌ نی‌یه‌ جوانێ،**
**سه‌ری کاسم، بنێمه‌ سه‌ر دڵی نه‌رمی! که‌ هیلاکی له‌شم**
**ده‌رکا، خه‌وی سه‌ر باوه‌شی گه‌رمی ئه‌گێرم چاوی بێ تینم،**
**به‌ تاریکی شه‌وا، سه‌رسام نی‌یه‌ پرشنگی دوو چاوێ،**
**که‌رووناکی بکا، رێگام..!**
**به‌ غه‌یری باڵی غه‌مناکی،**
**شه‌وی پر ترس و سامناکی،**
**نی‌یه‌ یه‌ك تۆزه‌ رووناکی!**

★ ★ ★

**نی‌یه‌ ته‌نیا به‌ریزادێ، که‌ پاڵم پێوه‌نێ، نازی که‌ به‌هره‌ی**
**سیس و ژاکاوم، ببوژێنێته‌وه‌، رازی تریفه‌ی ئه‌و، ته‌می**
**ئه‌م یه‌ئسه‌ راماڵێ له‌ سه‌ر چاوم وه‌کو لایلایه‌ ژیری کا، دڵی**
**منداڵی گریاوم به‌ڵێ گوێ هه‌ڵئه‌خه‌م بێجگه‌ له‌ خوره‌ی**
**سست و لێدانی! دڵی په‌ستم، که‌ نووزه‌ی دێ به‌ عاسته‌م**
**رازی په‌نهانی**
**نی‌یه‌ هه‌ر ده‌نگی هیچ نایێ،**
**له‌ هیچ شوێنێ له‌ هیچ لایێ**
**شه‌قه‌ی باڵێ شنه‌ی بایێ..!**

هه‌ر چه‌نده‌ شاعیر خۆی ئه‌م هه‌ڵبه‌سته‌ی بۆ سێ به‌ش دابه‌شکردووه‌، له‌ فۆرمی ناوه‌وه‌ی هه‌ڵبه‌سته‌که‌دا بیناو دارشتن، به‌پێچه‌وانه‌ی هۆنراوه‌که‌ی گۆران، هیچ رۆڵێکی سه‌ره‌کی تیادا نابینن. هیچ گۆرانێکی بنه‌ره‌تی له‌ بیریان له‌ رووداو یان له‌ وێنه‌ی شیعری له‌ نێوان ئه‌و سێ به‌شه‌دا نیه‌، هه‌ر چه‌نده‌ به‌ شێوه‌یه‌کی گشتی ئه‌و تاریکی‌و نائومێدی‌یه‌ شاعیر باسی ده‌کات، له‌ سه‌ره‌تای هه‌ڵبه‌سته‌که‌دا تا کۆتایی‌یه‌که‌ی، ورده‌ ورده‌ سه‌خت ترو قووڵتر ده‌بێت. راسته‌ به‌شی یه‌که‌م تۆزێك له‌سه‌ر رابردووی شاعیر ده‌روات:

**ژیان و ئه‌رکی ناخۆشی‌ی: په‌پوله‌ی ئارمزوی کوشتم**
**شه‌رابی جامی دڵداری، له‌ تاق لاوییا، رشتم!**

و به‌شی دووه‌میش ده‌رباره‌ی ژیانی ئێستای شاعیره‌:

**له‌ ته‌نیایی شه‌وی ژینا، ئه‌نێم هه‌نگاوی کوێرانه!**
**نی‌یه‌ ده‌ستێ، ده‌رمبێنێ له‌ناو ئه‌م گۆره‌ وێرانه**

و به‌شی سێهه‌میش زیاتر دووپاتی ته‌نیایی شاعیرو بێ به‌شی شاعیر له‌ هیچ جۆره‌ دڵدارییه‌ك ده‌کاته‌وه‌و له‌سه‌ر نائومێدیی‌یه‌کی ته‌واو ده‌وه‌ستێت:

**نی‌یه‌ ته‌نیا په‌ریزادێ، که‌پاڵم پێوه‌نێ، نازی**
**که‌ به‌هره‌ سیس و ژاکاوم، ببوژێنێته‌وه‌، رازی**

. . . .

**نی‌یه‌ هه‌ر ده‌نگی هیچ نایێ،**
**له‌ هیچ شوێنی له‌ هیچ لایێ**
**شه‌قه‌ی باڵ شنه‌ی بایێ..!**

به‌ڵام هه‌ڵبه‌سته‌که‌ به‌ گشتی یه‌ك ده‌نوێنێت و له‌ دوای هه‌ر خوێندنه‌وه‌یه‌ك، سه‌رپێیی بێت یا ورد، هیچ جۆره‌ گۆرانێکی بنه‌ره‌تی له‌ دارشتندا، به‌ شێوه‌ی ئه‌و گۆرانانه‌ی له‌ هه‌ڵبه‌سته‌که‌ی گۆراندا دیمان، لێره‌دا به‌دی ناکرێت.

سیحــرو کلیلی ڕوونکردنەوەی ئەم هەڵبەستە لە شتێکیتر دایە. بۆ دۆزینەوەی ئەم «نهێنیی‌یە» لەوانەیە سوود بەخش بێت ئەگەر بیر لەو لایەنانە بکەینەوە کەوا لەو هەڵبەستە دەکەن بە تێکرا وەکو یەك بنوێنێت، هەر چەندە لەسەر پەرە بۆ سێ بەش دابەشکراوە. ئەوەی یەکسەر سەرنجمان رادەکێشێ کەرەسەی ووشەی هەڵبەستەکەیە..سەیری کە چەند جار ووشەی (شەو) و ووشــەی تری نزیك واتا وەکو (تاریك) و (تاریکی)و (تەم)و (گۆڕ)و (چڵکن) دووبارە بوونەتەوە. بە ژماردن لە (٢٧) دێری ئەم هەڵبــەستــە (شــەو) چوار جار دووبارە بۆتەوە، (تاریك)و (تاریکی) دو جار، (تەم) دو جار، هەروەها ووشەی دژواری وەك (ڕووناك)و (ڕووناکی)و (چرا) بە هەمان شێوە، و ئاشکرایە بۆ هەمــان مەبــەست، دووبــارە بوونــەتەوە - (ڕووناکی) دوجار، (ڕوونــاك)و (چرا) هەر یەکە جارێك. هەمو ئەو ووشانەش بە ئاشکرایی بە کۆمەڵێك ووشەی کە دەوروبەری بابەتی سەرەکی نائــومێــدی هەڵبــەســتــەکە دەخولێنەوە بەستراونەتەوە - وەکو ووشــەی (نــاخــۆشی)و (مــەینــەت)و (ناکامی)و (تەنیایی) دوجــار)و (کــاس)و (ســەرســام)و (غــەمنــاکی)و (تــرس و سامنــاکی)و (سیس و ژاکــاو)و (یــەئس)و (پــەست). ئەم کەرەســەی ووشەیە سەرتاپا هەڵبەستەکە دەگرێتەوەو هەر لە یەکەمین تا دوا دێر بەدی دەکرێت و هەر بە ڕێگای ئەویشەوە شاعیر یەکێتی‌یەکی فۆرم، لە دەوروبەری تاکە بابەتی نائومێدی، بۆ هەڵبەستەکەی دروست دەکات.

بەڵام لەوەش گرنگتر لێرەدا سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشرێ کەوا جگە لە دووبارە کردنەوەی هێندێك ووشە- بە تایبەتی هێندێك ووشــەی سەرەکی وەکــو (تــەنیــای)و (شــەو) (تــاریکی)و (ڕووناکی)- ئەو دووبارە کردنەوەیە خۆی بە شێوەیەکی تایبەتی دووبــارە دەبێتــەوە، یاخود با بڵێین ئەو ووشانەی کە دووبارە دەبنەوەو ئەو ووشانەی لە واتادا لەیەك بابەتن بە شێوەیەکی تایبەتی دووبارە دەبنەوە. بۆ نموونە سەیری ئەو چوار جێگایەی ووشەی (شەو)ی تیادا بە کار هێندراوە بکە: (شەوی تەنیایی) (دێری‌ە)، (تەنیایی شەوی ژینا) (دێری ١٠)، (تاریکی شەوا) دێری ١٤)و (شەوی پڕ ترس وسامناکی) (دێری ١٧). لە هەر چوار جێگــا (شــەو) وەکــو دەربڕینی شتێکی هەست پێکراو (ملموس) (Concrete ) لیەگەڵ ووشەیەکی نەبینراوی واتایەکی (معنوی) (Abstract ) بە ستراوەتەوە: تەنیایی، تاریکی، ترس و سامناکی. بە تایبەتی لە نموونەی یەکەم دا، (شەوی تەنیایی)، چونکــە لێرەدا شێــوەی (استعــاره) (مجــاز) (Metaphor )ی وەرگرتوە، ئەو بەستنەوەی هەست پێکراو (محسوس)و نەبینراو (معنوی‌و مجرد) زۆر ڕوون و کارتێکەرە. زۆر ئاشکراشە کەوا شاعیر مەبەستێتی ئەو جۆرەی دارشتنی ووشە هەڵبژێرێت و سەرنجی خوێنەری بۆ رابکێشێت. سەیری کە هەر یەکسەر لە دووەمــین بەکــارهێنــانی ووشــەی (شــەو) چۆن شاعیر یاری بەهــەمــان جۆری دارشتن دەکــات و (شــەوی تەنیــایی) وەردەگــێڕێت بۆ (تەنیایی شەو)و لە هەمان کاتدا دارشتنێکی تازەی تری هەمــان جۆری، لە بەستنــەوەی هەست پێکــراو (ملمــوس)و نەبینــراو (مجــرد) پێکهێنراو، لە (شەوی ژینا)، دروست دەکات.

هەر ئەوەشــە بە رای من کلیلی، یاخود کلیلێکی، سەرەکی سیحری ئەم هەڵبەستە.

وەکــو مۆتیف (motif )ێکی (٣) هونــەریی هەردی ئەو جۆرە تایبــەتی‌یــە (مجــاز) (Metaphor )ی لە بەستنــەوەی شتێکی هەست پێکــراو لە گەڵ شتێکی مەعنــەوی پێکهــاتــوو بەناو دێــرەکــانی هەڵبــەستەکەی بڵاو دەکاتەوە (٤) تەنها لە بەشی یەکــەمی هەڵبەستەکە (کە بریتی‌یە لەشەش دێری درێژو سێ دێــری کورت) شەش مێتــافۆری (Metaphor ) لەم جۆرەمان هەیە: (پەپولەی ئارەزو)، (جامی دڵداری)، (تەمی ڕۆژانی پڕ مەینــەت)، (شــەوی تەنیــایی)، (چــرای ئاوات)، (دەستی ناکامی)و هەرچەندە بە هەمان جۆرە کۆمەڵکردن نیە، ئەو شێوە تایبــەتی‌یــەی مێتــافــۆر لە بەشی دووەم و بەشی سێهــەمی هەڵبــەستــەکــەشــدا بەردەوام دەبێت: (شــەوی ژینا)، (باڵی غەمناکی) لە بەشی دووەم و (تەمی ئەم یەئسە) لە بەشی سێهەم.

لێرەدا پێویستە سەرنجی ئەوەش بدەین کە هەڵبەستەکە لە هەمان کاتدا پڕیێتی لە جۆرە دارشتنێکی تری لە دو ووشەی هەست پێکراو (محسوس) یان دو ووشەی نەبینراوی (مجرد) پێکهاتوو کە هەر چەندە لە ڕووی دارشتنی ڕێزمانی‌یەوە لەو جۆرە میتــافــورەی باسمــان کرد دەچێت، لە ڕووی ئامرازی

شیعـری‌یـەوە زۆر لەو جیـایـەو تەنها وەکو سێبەرێك یاخود دەنگدانەوەیەك خزمەتی بە هێزکردنی ڕۆڵی ئەم جۆرە مێتافۆرە لە هەڵبەستەکەدا دەکات: بۆ نموونە (ژیان و ئەرکی ناخۆشی ی)و (تـاڤ لاویی)و (نیگاری خۆشەویستی دڵ) لە بەشی یەکەم و (خەوی سەر باوەشی گەرمی)و (تاریکی شەو) لە بەشی دووەمی هەڵبەستەکەدا.

کەواتە گومان لەوەدا نیە کە یاریکردن بە زمان و بە ئامرازی شیعـری، کە لە بنـەڕەتدا لە زمان پێکهاتووە، بە تایبەتی بەو جۆرە مێتافۆرەی کە باسمان لێوە کرد، لە بناغەی دارشتنی ئەم هەڵبـەستەدایەو چەند لەو مەبەستەی شاعیر زیاتر بکۆڵینەوە ئەوەنـدە تێگـەیشتنمـان بۆ هەڵبەستەکە قووڵتر دەبێت و ئەو چێژەی لێیوە وەردەگرین پتر دەبێت.

چونکـە هەرچـەنـدە ڕۆڵی ئەو جۆرە تایبـەتی‌یـەی مێتافۆر و کەرەسەی ووشە سەرەکی‌یە بۆ یەکێتی ئۆرگانی، ووردەکاری زمـانـەوانی تریش هەن لە هەڵبەستەکەدا کە شایەنی بایەخ پێـدانن، من لێرەدا دەمـەوێ پەنجـە تەنهـا بۆ یەکێـك لەو ووردەکاریانە درێژ بکەم، ئەویش شێوەی دارشتنی ڕستەکانە لە سێ بەشـە جیـاوازەکـانی هەڵبـەستەکەدا. وەکو لە پێشدا ووتمان هیچ جۆرە گۆڕانێکی بنەڕەتی لە بینا یان لە ڕوودا و یان لە بیر لە نێوان ئەو سێ بەشەدا بەدی ناکرێت و، وەکو ئێستاش دیمان، بە هۆی کەرەسەی ووشەو بە هۆی دارشتنی تایبەتی (مێتـافـۆر) هەڵبەستەکە بە تێکرا وەکو یەك دەنوێنێت. بەڵام ئەگـەر بە ووردی سەیـری دێڕەکان بکەین هێندێك جیاوازی گرنگ لە نێوان بەشەکانی هەڵبەستەکەدا دێنە بەر چاومان.

هەمـو دێـرە درێـژەکـانی بەشی یەکـەمی هەڵبەستەکە بە کرداری کۆتـایـیـان دێت: کوشتم، ڕشتم، بوو، بوو، خنکـانم، تاسانم، لە هێندێك لەو دێرانە ئەو جۆرە دارشتنەی ڕستە لەگەڵ دارشتنی ئاسایی ڕستەی کوردی دەگونجێت و لە هێندێکیان دا ناگونجێت، لەهەر دو حاڵەتدا شاعیر مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە جێگای کردار لە دێری دووەمی هەڵبەستەکەدا

**شەرابی جامی دڵداری، لە تاڤی لاوییا، ڕشتم!**

ئەوەنـدە لەگـەڵ ڕستـەی ئاسـاییدا ناگـونجێت وەکـو دێـرەکـانی‌تر. بەڵام لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە هەمو دێرەکان بە کردار کۆتـاییـان دێت و ئەمـەش جۆرە دووپاتکردنەوەیەك بۆ کردار دروست دەکات بە تایبەتی کردارەکانی:

کوشتم، ڕشتم، خنکانم، تاسانم، هەمو هێزو قورسایی ئەو بەشی یەکەمەی هەڵبەستەکە دەکەوێتە سەر ئەو کردارە سەرەکی‌یانە، بەوە شاعـیر زۆر زیـرەکـانـە ئازارەکـانی خۆی بۆ خوێنـەر دەردەبڕێت: کوشتنی ئارەزوو، بێ نەگەیشتنی دڵداری، مردنی ئاوات و تاساندنی دەروون.

**هەمـان جۆرە دووپاتکردنەوەی بەشێك لە بەشەکانی ڕستـە لە بەشی دووەمی هەڵبـەستـەکـەدا هەیـە، بەڵام ئەمجارە کردار نیە، ئاوەڵناوە، و زۆر جاریش بە شێوەی دارشتنی ناو و ئاوەڵناو پێکەوە. سەیری کە بەچی دێرە درێژەکانی ئەم بەشە کۆتاییان دێت: (هەنگاوی کوێرانە)، (گۆڕە وێرانە)، (دڵی نەرمی)، (باوەشی گەرمی)، (سەرسام)، (ڕێگام).**

**تەنهـا دێـری شەشـەم نەبێت کە بە ناو کۆتـایی دێت، ئەوانی‌تر هەمو بە ئاوەڵناو کۆتاییان دێت و چواریشیان بە ناو و ئاوەڵناو پێکەوە. لێرەدا ئاشکرایە (مۆتیڤی) (Motif) زمـانەوانی سەرەکی لە ناو و ئاوەڵناو پێکهاتووە چونکە جگە لە قافیەکان، لەناو دێرەکانیش دا دوجاری‌تر دووبارە بۆتەوە: (سەری کاسم) و (چاوی بێ تینم). هەروەها لە بەشی سێهەمی هەڵبەستەکەدا زۆربەی دێرەکان تەنها بە ناو کۆتاییان دێت:**

**ناری، رازی، چاوم، لێدانی، لایێ، بایێ هتد.**

**لێرەدا مەبەستی شاعیر تۆزێك جیاوازە لە بەشەکانی‌تر و دەیـەوێت هێنـدێـك وێنـەی شیعـری تازە، بە تایبەتی ئەوانـەی لە دەوروبەری دڵدار وەکو منداڵ دەخولێنەوە، بخـاتـە ناو هەڵبـەستەکەی و لەبەراووردکردنا ناکامی‌و تەنیایی‌و نائومێدیەکەی بابەتی سەرەکی هەڵبەستەکەیە خەست تر بکـات و بیکەیەنێتە ئەنجام. لەبەر ئەوە ئەو ناوانەی، وەکو ناز و ڕاز، کەلە قافیەکاندا دەردەکەون، بە هێنـدێـك ناوی‌تـر مۆوتوربەکراون کە بۆ یەکەم جار لە هەڵبەستەکەدا بەکار دەهێنرێن وەکو (بەهرە) و (تریفە)و (لایـلایـە). ئەم ووشە تازانە، بە هۆی وەستانیان وەکو**

**دژوارێك، كاریگەری ووشەكانی لە بابەتی پێشوو، وەكو (سیس)و (ژاكاو)و (تەم) و (یەئس)و (سست)، قوولترو تاڵتر دەكەن.**

**كەواتـە ئەگـەر كلیلی سەرەكی هۆنراوەكەی گۆران لە بینـاو دارشتنـە درامایی‌یەكەی‌دا بێت ئەو هەڵبەستەی هەردی بەردی بنـاغـەكـەی زمان و ئامرازی شیعری‌یە. لێرەدا شتێكی بەجێ ئەبێت ئەگـەر بۆ لێكـۆڵینـەوە لەو لایەنانە بۆ بەرهەمەكانی تری هەردی و گۆران برۆین. بۆ نموونە دەتوانرێ بەئاسانی لە رۆڵی هەمان جۆرە مێتافۆر لە هێنـدێك لە هەڵبەستەكانی تری دیوانی هەردی زیاتر بكۆڵرێتەوە، وەكو بۆ نموونە لەو دێرانەی خوارەوە:**

**تاقانە خونچەی باخی ژیانم...**
**زیندوكەرەوەی ئاواتی بێ گیانم!**

(تانكۆی كوردی، ل ٥٢)

**بناغەو چینی دیواری،!**
**تەلاری بەرزی دلداری**

(شۆرشی نائومێدی، ل ٥٥)

**بەسەر سامی لەسەر لوتكەی بڵندی گەنجی وەستاوم!**
**شریتی عومری رابوردووم وەكو خەو دێتە بەرچاوم**

(دڵێكی تێكشاو، ل ٥٨)

**لە كانی قوڵی دڵما: كە بۆتە گۆری ئاوات**
**رژاوە نەقش باڵای بڵندی ئاڵۆوالات!**

(شانزە ساڵ چاوەروانی، ل ٦٤)

**قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو**
**خۆت نـ خەیتە بەر شەپۆلی ئەشكی بێ‌پایانی شەو**

(پێنج خشتەكی لەسەر غەزەلێكی شێخ نووری، ل ٦٦)

**فاتمە! د_و چاو ی مەستت، پر تەلیسمی جوانی‌یە**
**پر شەرابی خوشەویستی و عارەقی یەزدانی‌یە**
**بووكی رازاوەی خەیاڵم! گیانەكەم ست فاتمە..!**

(چەپكە گوڵێك بۆ ست فاتمە، ل ٦٨_٦٩)

هەروەها دەتوانری زیاتر لە رۆڵی بیناو دارشتنی گشتی هۆنراوە لە هەڵبەستە لیریكە بە ناوبانگەكانی گۆران بكۆڵرێتەوە، من خۆم ئەم لایەنەی هێندێك لەو لیریكانەم سەیر كردووە، بە تایبەتی، (ئافرەت و جوانی!)، (رەوتێكی جوان!)، (بۆ جوانی سەرە رێ)و (جوانی بێ ناو) (٥)

بەلام ئەوەی لێرەدا دەمەوێ بیكەم، سەیری دو هەڵبەستی ترە، هێندێك بە خێرایی، پێش ئەوەی بتوانرێ هێندێك سەرنج و ئەنجـامی گشتی دەربـارەی تیـۆری بۆ ئەم تاقی‌كـردنـەوە پراكتیكی‌یە تۆمار بكرێت. ئەگەر لە (رازی تەنیایی) هەردی‌یەوە بۆ (پـایـز)ی گۆران بچـین لەوانـەیـە دۆزینـەوەی كلیلی ئەم هەڵبەستە ئاسانتر ببێت:

## پایز!

**پایز! پایز!**
**بووكی پرچ زەرد:**
**من مات، تۆ زیز:**
**هەر دوو هاودەرد!**

**من فرمێسكم، تۆ بارانت،**
**من هەناسەم، تۆ بای ساردت،**
**من خەم، تۆ هەوری گریانت..**
**دوایی نایە: دادم، دادت،**
**هەرگیز، هەرگیز،**
**پایز! پایز!**

**پایز! پایز!**
**شان و مل رووت،**
**من مات، تۆ زیز،**
**هەر دوكمان جووت**

**هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،**
**ئاڵتوونی دار ئەرژی بگرین،**
**پۆلی باڵداری ئەفرێ بگرین،**
**بگرین.. بگرین.. چاومان نەسرین،**
**هەرگیز، هەرگیز،**
**پایز! پایز!** (٦)

ئاشکرایە لێرەدا کۆمەڵێك مێتافۆری یەك جۆرە نیە کە رۆڵی سەرەکی لەو هۆنراوەیەدا دەبینن، بەڵام تەنها یەك مێتافۆری درێژکراوە (Extended Metaphor) لەناو هەمو هەڵبەستەکەدا. لێرەدا پایز وەکو ئافرەتێك، (بووکی پرچ زەرد) هەر لە سەرەتای هەڵبەستەکەوە تا کۆتاییەکەی پێشاندراوەو رووی تێکراوەو قسەی لەگەڵدا کراوە. ئەمە وەکو دەڵێن پڕبڕەی پشتی هەڵبەستەکەیەو بەردی بناغەکەیەتی لە هەمان کاتدا زۆر شتی تریش هەیە لەناو ئەم هەڵبەستەی لە یەکەم خوێندنەوەدا ساکار دێتە پێش چاو.

پێش هەمو شتێك خودی شاعیر خۆی کە رۆڵێکی گرنگی هەیە لەم هەڵبەستەدا. شاعیر یاخود قسەکەر لەم هەڵبەستەدا خۆی بەرامبەر بە پایز (کەواتە سروشت و لە هەمان کاتیشدا ئافرەت) دادەنێت و زۆر زیرەکانە تەنها بە رێگای دووبارە کردنەوەی دو وشەو دو دیاردەی لەیەك چووی وەکو مات و زیزو فرمێسك و باران و هەناسەو بای سارد و خەم هەور هتد یەکێتییەك لە نێوان خۆی (وەکو ذات) و پایز (وەکو موضوع) دروست دەکات. هەر ئەوەشە هەوڵی سەرەکی ئەم هەڵبەستە دروست کردنی یەکێتی لەنێوان دو شتی دژوار:
پایز و ئافرەت، سروشت و مرۆڤ، دەروونی شاعیرو سروشتی ژیان هتد. کەواتە هەمو هەڵبەستەکە لەسەر دولایەنییەکی بنەرەتی دامەزراوە کە بە زۆر شێوە لەناو کەسانی سەرەکی هەڵبەستەکە (پایزو ئافرەت و شاعیر خۆی)و لەناو ئەو وشەو دیاردە لەیەك چووەکانی باسمان کردن و تەنانەت بە رێگای دووبارە کردنەوەیەکی رووت (پایز! پایز!، هەرگیز، هەرگیز هتد) یاخود (من مات، تۆ زیز) یاخود (بگرین.. بگرین) خۆی دەنوێنێت.
ئەگەر لە یادمان بێت کە هەوڵی دروست کردنی پێوەندییەك و یەکێتییەکی بەهێز لەنێوان ئافرەت و سروشت و هونەردا یەکێکە لە لایەنە هەرە گرنگەکانی بیری رۆمانسی گۆران (٧)، بۆمان دەردەکەوێ چەند بە زیرەکی و بە ووردی ئەو هەڵبەستە کورتە ئەو مەبەستەی گۆران دەردەبڕێت.

**لە کۆتاییدا، مەرج نیە (مۆتیف) لە بەرهەمی شیعریدا (مێتافۆر) بێت، وەکو لە (رازی تەنیایی) یەکەی هەردیو شاعیر دەتوانێت هەر لایەنێکی هۆنراوە - لە دارشتن بێت یا یا لەبیر لەزمان یا لە وێنەیشیعری - بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنێت. بۆ نموونە سەیری سروودی (ئەی رەقیب)ی دڵدار بکە**

**ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**
**نای رەمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**

**ئێمە رۆڵەی رەنگی سوورو شۆرشین**
**سەیر بکە خوێناویە رابوردومان**

**ئێمە رۆڵەی میدیاو کەی خوسرەوین**
**دینمان ئاینمانە نیشتمان**

**کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە**
**زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان**

**چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕەشێر**
**بوون بەقوربانیو هەموویان نێژران**

**لاوی ئێستاش حازرو ئامادەنە...**
**جانفیدانە جانفیدانە جانفیدان**

**لاوی کورد هەڵسانە سەرپێ وەك دلێر**
**سابە خوێن نەقش ئەکەن تاجی ژیان**

**کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە**
**زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان**

سەیری کە چەند بە زیرەکیو ناسکی دڵدار (مۆتیفی) دووبارەکردنەوەی (Repetition) هۆنیوەتەوە ناو سروودەکەی بە شێوەیەك کە لە ئەنجامدا بۆتە کلیلی سیحریو کاریگەریی ئەم بەرهەمە بەناوبانگە. لە کۆپلەی یەکەمدا، بە هێمنی. لەیەك

جوونی (زوبان)و (زەمان) لەرووی دەنگەوە ئەو (مۆتیفە)مان پێشکەش دەکات، کە خێرا لە کۆپلەی دووەم و سێهەمدا، بە رێگای (سوور)و (خوێناوی)و (میدیا)و (کەی خوسرەو)و (دینمان)و (ئاینمان)، بەهێزتر و ئاشکراتر دەبێت. تا لە کۆپلەی چوارەم و کۆتایی بەشی یەکەمی هەڵبەستەکە ئەو (مۆتیفە) دەگاتە لووتکە بە دووبارە کردنەوەی وشەی (کورد)و وشەی (پەندووە)، بە تایبەتی وشەی دووەم کە بە چەقاندنی لە قافیەی دێری یەکەم و لە سەرەتای دێری دووەم جێگایەکی سەرەکی پەیدا ئەکات لەناو هەمو هەڵبەستەکە بە تێکرا.

کۆپلەکە بە گشتیش کۆپلەیەکی سەرەکییە لەناو هەڵبەستەکەداو لە کۆتاییدا دووبارە دەبێتەوە تا ئێستا ئەو وشانەی دووبارە کراونەتەوە لەیەك دەچوون لە رووی دەنگەوە (زوبان وزەمان) یا خود لە رووی واتاوە (سوور و خوێناوی، میدیاو کەی خوسرەو، دین و ئایین)، بەڵام ئێستا لەو کۆپلە سەرەکییە وشەکان وەکو خۆیان دووبارە بونەتەوە:

هەر بە رێگای ئەو کۆپلەیەشە کە هەڵبەستەکە بەرەو بەشی دووەمی دەڕوات و بەتایبەتی بۆ دووبارە کردنەوە کاریگەرەکەی کۆپلەی شەشەم:

**لاوی ئێستاش حازر و ئامادەنە**
**جانفیدانە جانفیدانە جانفیدان**

و بۆ دووبارە کردنەوەی کۆپلەکە بە تێکرا لە دو دێری کۆتایی هەڵبەستەکەدا. هەر کەسێ بەشداری کرد بێ لە ووتنی بە کۆمەڵی ئەم سروودەدا یەکسەر هەست بە گرنگیی ئەو دووبارە کردنەوەیە لە هەڵبەستەکەدا دەکات.

ئەگەر بەرەو روونکردنەوەیەکی هێندێك لایەنی تیۆری نظرية) بۆ ئەم سەرنجە رەخنەییە پراکتیکیانە بڕۆین، لە وانەیە زاراوەی هاوشانی (تـوازی) (Parallelism)، بە واتا گشتییەکەی، لە هەمو زاراوەیەکی رەخنەییتر باشتر بێت بۆ دەستنیشان کردنی تایبەتی فۆرمی هۆنراوەو بەڵکو فۆرمی هونەریی بە شێوەیەکی گشتیش.

بێگومان هاوشانیو نەخشە (نمط) دروستکردن لە مۆسیقاو لە هەمو هونەرە تەشکیلیەکان دا شتێکی سەرەکیو ناسراوە). لێرەدا مەبەستمان لە هاوشانی تەنها واتا رەوانبێژییەکەی نیە، بەڵکو واتا گشتییەکەیەتی کە هەمو جۆرە نەخشەکێشانێکی سەرەکی لە بەرهەمی ئەدەبی دەگرێتەوە. بۆ نموونە لە (رۆڵەی بێ دایك)ە کەی گۆران هاوشانی.لە بیناو دارشتنی هەڵبەستەکەیە بە گشتی کە شان بە شان (ئیقاع)ێکی سەرەکی ژیان و هونەری پێکهاتوو لەسەرەتاو ناوەراست و کۆتایی دەڕوات. هەروەها لە (رازی تەنیایی) هەردیدا دووبارەکردنەوەی کەرسەیەکی تایبەتی وشەو جۆرێکی تایبەتی (مێتافۆر)و دووبارەکردنە]وەی هێندێك بەشی تایبەتی رستە (کە هەمو پێوەندیان بە زمان و یاریکردن بە زمانەوە هەیە) نەخشەیەکی سەرەکی ئەم هەڵبەستەیە. بەهەمان رێگاش تاقە مێتافۆرێکی سەرەکی درێژکراو بەناو هەمو هەڵبەستەکەو نەخشەیەکی تایبەتی دووبارەکردنەوەی ووشە هاوسەنگی تایبەتی هەڵبەستی (پایز)ی گۆرانەو (ئەی رەقیب)ی دڵداری دروست دەکەن.

لە هەمان کاتدا کە هاوسەنگی زاراوەیەکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتنی هونەری هۆنراوە، لەوە دەچێت ئەو زاراوەیە بەتەنها نەتوانێت هەموو لایەنەکانی هۆنراوە روون بکاتەوە و پێویستی هەیە بە زاراوەیەکی تر کە دەستنیشانی گۆڕین و گواستنەوە و تەنانەت تێکدانی ئەو جۆرە هاوسەنگییە لە بەرهەمی ئەدەبیدا بکات. ئەمەش تەنها بەرێگا لادانە (انحراف) (Deviation) لەو جۆرە سیستەمەی (نظام) (System) لە سەر زمان و تێروانینی ئاسایی رۆژانە دامەزراوە یاخود لەو جۆرە سیستەمەی هۆنراوەکە خۆی دروستی دەکات بۆ ئەوەی مەبەستە هونەرییەکەی بەرهەمەکە رونتر و دیارتر بێت.

**بۆ نموونە هەڵبەستەکەی (رۆڵەی بێ دایك) ی گۆران ئاشکرایە، وەکو ووتمان، جۆرە بیناو دارشتنێکی درامایی زۆر دیاری کراوی هەیە. ئەم جۆرە (ئیقاعە) (Rhythm) بریتییە لە پێشەکی ولووتکە (یا ئاڵۆز کردن) و ئەنجام و لەهەمان کاتدا کە ئیقاعێکی هونەری سەرەکییە لە هەموو (ئیقاعە) کانی سروشتیش سەرەتایی و بنەرەتی ترە.**

ئەو ئیقاعە ئیقاعی ژیانە ، هی چوار وەرزی ساڵەو هی هەمو دیاردەکانی سروشتە. بەڵام ئەم جۆرە نەخشەیەی لەو

هۆنراوەیەدایە نەخشەیەك و هاوسەنگی‌یەكی هونەری‌یە چونكە لەناو بۆتەیەكی هونەری دایەو لە هەمان جۆرە نەخشە لە ژیان لە سروشتدا جیا دەبێتەوە. هەروەكو فۆرمالیستە رووسەكان دەڵێن ئەو لادانە لە ڕێگای نەخشەی ئاسایی ژیان و سروشت لە كاكڵەی هەمو بەرهەمێكی هونەری دایەو ئەوەیە كە لە بەرهەم و دیاردەكانی تری ژیان جیایان دەكاتەوە. هەرچەندە لێرەدا من لە گەڵیاندا نیم كە هەمو هونەر و هەمو ئەدەبێك هەر ئەبێت سەرنج بۆ ئەو هونەریەتەو ئەو ئەدەبیەتەی خۆی رابكێشێت و هەر ئەوەشە هەمو ئامانجی ئەدەب و هونەر كە هەستی خوێنەر یا بینەر بۆ جیابوونەوەیان لە ژیان زیندوو بكاتەوە و هەمیشە ئامادە بكات، هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی كلیل و سیحری تایبەتی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی بەشتێكی چاك و سوود بەخش دەزانم. لێرەدا كت و پڕی‌یەكەی گۆران بە گۆڕینی وێنە سەرەكی‌یەكەی هەڵبەستەكەی كاكڵەی هونەریەتی ئەم هونراوەیەو بەوەوە فۆرمی تایبەتی هۆنراوەكە تەواو دەبێت و بەرهەمەكە لە هەر گێڕانەوەیەكی ڕۆژانەی ئاسایی ئەم جۆرە كارەساتەو لە هەر ئیقاعێكی هەمان جۆری لە سەرەتاو ناوەندو كۆتایی پێكهاتوو لە ژیان و لە سروشتدا جیا دەبێتەوە.

هەروەها بە هۆی ئەو هەمو یاریكردنە بە زمان و ئامرازی شیعری‌و بە تایبەتی، وەكو ووتمان، بە كەرەسەی ووشەی ڕەش بینی تایبەتی‌و بەجۆری مێتافۆر و دارشتنی ڕستەی بۆ هەمان مەبەست تەرخان كراو لە یەكەم تا دوادێڕی (رازی تەنیایی) یەكەی هەردی، ئەم هەڵبەستە دەربڕینێكی بەهێزو كارتێكەری تەنیایی‌و نائومێدی پێشكەش دەكات، بەڵام، لە هەمان كاتدا، هەر بە هۆی ئەم زمانە خەستە پڕ مێتافۆر، نائاسایی‌یەو هەر بە ڕێگای ئەو ئەدەبیەتە تایبەتیە بەرهەمەكە بەسەر ڕەشبینی و نائـومێدیەكەی‌دا سەر ئەكەوێت و لە بۆتەی ئازاری ڕۆژانەی ژیانێكی تاڵ دەرئەكات و ئەیخاتە ناو ئەو بۆتە تایبەتی‌یەی هونەرێكی جوان. كەواتە ئەو زمانە تایبەتی‌یەی (رازی تەنیایی) كە وەكو ووتمان كلیكی سیحری هەڵبەستەكەیەو ئامرازی سەرەكی دەربڕینی بابەتەكەیەتی، لە هەمان كاتدا هەر ئەویشە هۆنراوەكە لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانەدا دەپچڕێنێت و لەبەر ئەوەش دەتوانێ ببێتە ئامرازی سەركەوتن بەسەر ئەو نائومیدی‌یەو ئەو ڕەشبینی‌یە.

هەروەهاو بەهەمان ڕێگاش بیری فەلسەفی و بیری كۆمەڵایەتی لە (پایز)ی گۆران و (ئەی ڕەقیب)ی دڵداردا خراونەتە ناو فۆرمێكی هونەری تایبەتی. لە (پایز)دا گۆران بە بێ هیچ جۆرە پێشەكی‌یەك و ڕوونكردنەوەیەكی ئاسایی‌و تەنها بە ڕێگای ئامرازی مێتافۆری درێژكراوەوە ئەو بیرە ڕۆمانسی‌یەی خۆی، كە لە چەندین هەڵبەستی دو دیوانی پێشوویدا دەری‌بڕیبو، لێرەدا خەست و پوختە كردوتەوە. هەروەها دڵداریش لە (ئەی ڕەقیب) دا، بە دەست سووكی‌یەكی هونەری وەستایانە، تەنها بەڕێگای ئامرازی دووبارەكردنەوە، بەرزترین دەربڕینی پێ داكوتان و گیان فیدایی‌و مانەوەی میللەتەكەمانمانی پێشكەش كردووە.

لە هەر دو نموونەدا دارشتنی تایبەتی زمانی هۆنراوە (كە لە هەڵبەستەكەی گۆران كلیلەكەی مێتافۆرەو لەوەی دڵدار دووبارەكردنەوەیە) تەنها ڕێگایە بۆ لادان لە زمانی ڕۆژانەی ئاسایی (و هەروەها لە زمانی ئاسایی زانستی، ئەكادیمی بێت یا ڕۆژنامە نووسی كە ڕێگای ئاسایی دەربڕینی ئەو جۆرە بیرە فەلسەفی‌و كۆمەڵایەتیانەیە كە لە دو هەڵبەستەكەدا پێشكەش كراون)و دروست كردنی فۆرمێكی ئەدەبی بەرز كە لە ئاستی ئەو بیروباوەڕانەدا بێت.

## پەراوێزەكان

١ـ (دیوانی گۆران)، بەغدا ١٩٨٠، ل ١٩٨

٢ـ ئەحمەد هەردی، (رازی تەنیایی)، چاپی دووەم ١٩٨٤، چاپچانەی زانكۆی سەلاحەدین، ل ٧٩ـ٨٠

٣ـ مەبەست لە (Motif ) ئەوەیە كە، لە فۆرم یا ناوەڕۆكدا، بەتایبەتی لە وێنەكێشان و مۆسیقا، دووبارە دەبێتەوە.

٤ـ كاكەی فەللاح لە (كاروانی شیعری نوێی كوردی)، بەرگی یەكەم، بەغدا ١٩٧٨، ل ١٤٩، زۆر بە باشی بۆ ئەو ووردەكاری‌یە چووە.

٥ـ بڕوانە (ڕۆمانسیەتی گۆران)، كاروان، ژمارە، ل

٦ـ (دیوانی گۆران)، ل ١٦٣

٧ـ بڕوانە (ڕۆمانسیەتی گۆران)

٨ـ عبدالخالق علاء الدین، (دڵدار: شاعیری شۆرشگێری كورد)، ئەمیندارێتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان ١٩٨٥، ل ١٧٤

●

# کانێ بەرهەمێن نڤیسکار و دیرۆک نڤیس ئەنوەر مائی؟

نڤیسینی: د. رەشید زیران
ئیسماعیل تەمیا ژ تیپێت لاتینی ڤەگوهەستیە

رۆژنامە نڤیسیا کوردی ژ ڕۆژا دەرکەتنێ وو هەیا نهە ڕۆلەکە مەزن لیستی‌یە وو دبرە د مێژوو یا گەلێ کورد دا ، چی لۆرگانێن چاپەمەنی دەرکەتنە وو دەر دکەڤن سەرچاڤە گران بەها نەژی خەندەڤانان ڕا وو ب تایبەتی ژ لێگەرڤانان ڕا .

گوڤارا ڕۆناهی‌یێ‌یا[1] ڕەحمەتی جەلادەت بەدرخان ، یەك ژ گوڤارێن تیبەتی‌یا د دیرۆکا ڕۆژنامەڤانی‌یا کوردی دە . ئەمێ د جهەکی دن دا ڤەگەرین سەر وی ، لێ دڤێر دا ئەم دخوازن ب کورتی ل سەر نڤیسکار وو دیرۆك ڤان ئەنوەر مائی ب پەیڤان وو مەبەستا مە ئەوە کو ئەم ب بەرپرسیاری ڕاوەستن بەرامبەر کەلەپوورا نەتەوەیی وو ڕەوشەنبیرێن خوە بناسن وو وانا بناسین .

د داویا سالا ١٩٨٣ یا ئەم نێزیکی هەفتەکی ل پەرتوکخانا ئەنستیتویا کوردی ل پاریسێ مژوولی گوڤارا ڕۆناهی‌یێ بوون ، ب ئەشقەکە مەزن مە ڕووپەلێن وی د خوەندن ، لە وارا یەکەمین جار بوو هەموو ٢٨ هەژمارێن وی کەتبوون دەست مە . گاڤا ئەم گهیشتن ڕووپەلێن ١٠-١١ ژ هژمارا ١٢ ، لیستا بەرهەمێن مەلا ئەنوەر ، ئان لاوی چیا (بەرنافێ وی بوو) بالا مە ڕا کیشاند وو ب ڕاستی خەم وو کەسەر ژ مە ڕا پەیدا کرن ، وە پرسەك داهات پێشیا مە ، کو ئەم ل پەی وێ بگەرن ، بزانن چ بەرهەم چاپ بوونە ، چ دەستنڤیس مانە؟

ناڤێ مەلا ئەنوەر جارەکێ ب مە ڕە د گوڤارێ هاوارێ‌دا دەرباس بوو[2] د وێ هەژمارێ دە هۆزانڤان هەلبەستەك ب سەرنڤیسیا «بەیتا کەوێ» بەلاڤ کربوو سێ پەرچە هەلبەست د ڕۆناهی‌یێ دە چاپ کرنە : سەربەست[3] ، پرسا من ژ خوەدێ[4] وو جەواب ژ خوەدێ[4] وو د هژمارا ١٢ دوازدا دە ئەم دابوون ناسین ، کو مەلا ئەنوەر ل گوندێ مائێ ، دۆر هێلا ئامێدیێ ، سالا ١٩١٣ یا هاتیە دنیایێ ، ژ بنەمالەکا ئۆلی وو ویژە پەروەر . خوەندنا خوە ل بەر دەستێن مەلایێن بناڤ وو دەنگ ل دهۆکێ ، زاخۆ ، ئامێدی‌یە وو ئەربیلێ خەلاس دکە ، ب خوە ، دبە مەلا وو ژ بلی مژادێن ئۆلی مامۆستا ئەنوەر مائی نەفسەکە نیشتمان پەروەری ب فەقێن خوە دە بەردده[5] وو وانا هینی ئالفبێیا لاتینی کوردی دکە .

هەیا سالا ١٩٤٣ یا ، ئەم دزانین کو ئەو مەلاتیێ دکە ، پشتی وێ دەمێ وەك ژ ژێدەران تێ زانین کو ئەو تەڤ ژیانا ڕۆژنامەڤانی دبە ، بەند ، گۆتاران ب کوردی ، عەرەبی دنڤیسینە ، بایەخەکە مەزن دبە پرسێن دیرۆکێ ، دو بەرهەمێن هێژا د وێ بابەتێ دە ب زمانێ عەرەبی ژمە رە دهێلە[6] . دیرۆك نڤیسێ مەزن دۆکتۆر کەمال ئەحمەد مەزهەر چالاکیا مێژوو نڤیسیا ئەنوەر مائی ب ڤی جورەیی دنرخینە : «ئەنوەر مائی یەکە ژ وان سەربازێن کە ب دلسۆزی هاتیە مەیدانا مێژوو نڤیسیا کوردی»[7] ئەنوەر مائی خوەدیێ تەخلیت بەهرە بوو ، ئەو سەربازەکی نەناسە د واری هەلبەستڤانی دا ، وەك ژ ڕۆناهیێ تێ زانین ، گاڤا تەمەنێ وی سی و سێ «٣٣» سالێ بوون . د سالێن سی وو چەلی دا ژ بابەلیسکا بیستان ، دەما برایێن بەدرخانیا جەلادەت وو کامیران سەر گۆڤەندیا ڕۆژنامەڤانیا کوردی (د کورمانجیا ژورێن دا) دکشاندن ، وێ هەیامێ هۆزان ئەنوەر مائی ژی ڕوویێ هژمارەکە ڕۆناهیێ دخەملینە ب لیستا هن بەرهەمێن خوە ، ئەم ژی وانا ڕابەری خوەندەڤانان دکن :

١ – دیاریا لاوان . پەند وو شیرەت ل سەر ژیانا جیڤاکی وو وەلات پارێزیێ .
٢ – کتێبا گەرگوری ، ب ناڤێ «لەیلانەکا سپی» ، وەرگەراندیە کوردی .
٣ – مەولوودەکە کوردی ، مەنزووم
٤ – ئەرتەپێلەکە (کتێبەکە) مەتەلۆکێن کوردی ، قەدەرێ (٢٠٠٠) مەتەلۆك تێ دەنە .
٥ – ئەرتەپێلەکە پاوەریێ ، مەنزووم
٦ – دیوانا مەلا ئەنوەر ، شیعرێن وەلاتین ، هەیران وو وەسف[8] ئەڤ لیستا خەم وو کەسەر ژمە رە پەیدا کرن . . ڤایە پێتری چەل سال د سەر ڕە بهوورن وو خوەوییێ وێ ٢١ سالن (سالا ١٩٦٣ چوو ڕەحمەتێ) سپاردەیی ئاخا کوردستانێ بوویە وو چاڤێن مە ب بەرهەمێن چاپکری نەکەتنە . لێ ڕۆژناما هاواریێ ب سەر دە بەد خەبەرێ ددە مە . کو پرانیا هەلبەستێن هۆزان هندا بوونە وو هاتینە شەوتاندن ، هەروەها چەند پەرچە هەلبەست ب دەست مامۆستا جەمال سلێمان دە مانە[9] زۆر عەیبن ئەگەر ئەنجام وە چکۆس، بە !

هین ڕوویەکی دن ژ چالاکیا ڕەحمەتی ئەنوەر مائی ژمە ڕە تێناسین ، وی دلسۆزی باش زانی بوو بایەخا بەرهەمێن بەرهەڤ نەکری ، پێن مابنە د پاش دیوارێن ڤەپەنی دا ، ئەو ب خوە کارەکی مەزن دکە : «گەلەك نڤیسین ل سەر ئێزیدیا نڤیسینە وو گەلەك ژی کۆم کرنە ، بەلی عەیبن نەگەهیشت هەمیا بەلاڤ کەت وو هەتا دووماهیێ ل دوو ئەڤ بچێت»[10] .

ئەو دەستێ خوە داڤێژە نهێنیێن ئۆلا ئێزیدیان ، هین بەلگەیێن پیرۆزی ژی وی ئۆلی ، پشتی مرنا وی ڕابەری خوەندڤانان دبن . هەلبەست ڤان تاها مەزهەر مائی هن تێکستێن (مەتنێن) نوو ژ «مەسحەفا ڕەش» وو «جلوێ» بەلاڤ دکە[11] وو مە دناسینە ب هن مژادێن وان ئەسەرێن نرخین .



ڕۆژگارا بەرهەمان ژ وەکا زینداران دژوارە ، سەختە .
پرانیا بەرهەمێن ل سەر خاکا کوردستانێ هاتنەڤەهاندن ، ژێگە ژ وان ڕە ، ژی خوەدیێ وان ڕە پر جاران پێدلۆڤان بوویە . ئەم باوەر ناکین ل دنیایێ ئی میللەت وا بەرهەمێن نڤیسکارێن وان قەدەخە کری بن ، شەوتاندی بن وەك مە کوردا . لێ تەڤ هەر تشتی پێویستە ئەم فەرسەندێ بەرندن : بنڤیسین ، وەرگەرینن ، بکۆلینن ، بلیمەت وو ڕەوشەن بیرێن خوە بناسین ، بناسینن ، بپارێزن وو ڕۆژ ب ڕۆژ هەبوونا خوە دەولەمەند بکەن ب شاکار بەرهەما .

ژێدەر :
(١) یەکەمین هژمارا «ڕۆناهی» یێ د یەکێ نیسانێ دا ، سالا ١٩٤٢ دا دەرکەت ل شامێ . خوەدی وو بەرپرسیارێ وێ : میر جەلادەت عالی بەدرخان بوو ، شێوەکی گشتی کۆڤار هەر مەهێ جارەکێ دەردکەت هژمارا (٢٨) یا لە داوێی د ئادارا (١٩٤٥) دەرکەت .
(٢) بنێڕ : هاوار ، هەژمارا (٥٢) یا (٢٠) یا کانوونا پاشین ، ١٩٤٣ ، ڕووپەل . (٧) .
(٣) ڕۆناهی ، هەژمارا ١٢ یا ، لێ ئادارێ ، ١٩٤٣ ، ڕووپەل (١١) .
(٤) ڕۆناهی ، هەژمارا (١٦) یا لێ ئیرمەهێ ، ١٩٤٣ ، پرووپەل (٨–١٠) .
(٥) بنێڕ : هەلبەستا «سەربەست» ، ڕۆناهی ، هەژمارا (١٢) .
(٦) ١ – عەزەوە ل سەر کوردان ل چینێ ، بەغداد ، ١٩٥٩ ، (ب عەرەبی) .
٢ – کورد ل بەهدینان ، موسل ، ١٩٦٠ ، (ب عەرەبی) .
(٧) دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد ، مێژوو ، کورتە باسەکی زانستی مێژووی کورد وو مێژوو . بەغداد ، ١٩٨٣ ، ڕووپ ١٧٩ . مە گۆتنێن دکتۆر وەرگەراندن سەر کورمانجیا ژورین .
(٨) ڕۆناهی ، هژمارا (١٢) یا لێ ئادارێ ، ١٩٤٣ ، ڕووپ (١١) .
(٩) بنێڕ : هاوکاری ، ١٩–٧–١٩٨٤ ، ڕووپ (١٠) .
(١٠) تاها مەزهەر مائی ، تێکستەکە نوو ژ ئۆلێ ئێزیدیانی ، ڕۆشنبیری نوێ ، هژمارا (١٠٢) یا ، تەمووز ١٩٨٤ ، ڕووپ (٨٧) .
(١١) بنێڕ : ژێدەرا بالاکری ، ڕووپ (٨٧–٩٢) .

# بەســــــــەرهات

ڕۆژێك گوتیانە بولبولێ
بەسە ئاوازت هەڵڕێژی
بەستەو گۆرانی ببێژی
بەرامبەر جوانی گوڵزارێ
بۆ شۆخی نیگای بەهارێ
ئەوەی هەتە بۆ خۆت بلێ!
چیتە لە خوناوی زارێ
چیتە لەشەنگی نیگارێ
چیتە لە سووری کڵوکێ
ئەو ماندوو بوونەتە بۆکێ؟!
بەکورتی بولبول پێی ووتن
ڕێی بەڵگەیانی لێ گرتن:ـ
گەر بۆ خونچە من نەخوێنم
چۆن گوڵ دەبێتە یاری من!
گەر ئاوازی گول نەڕژێنم
بەسۆز نابێ بەهاری من!
بۆ نازانن ......
من بولبولم دەنگم هەبێ!
من جوانیمە ڕەنگم هەبێ!
ئازادیمە زەنگم هەبێ!
دڵداریمە بەنگم هەبێ!
کەزانیان......
ئەم قسانە چارە ناکات
ئەم بەهانە پارە ناکات
پەڕو باڵی بولبولیان کرد
بەرەو ژووری قەفەسیان برد

چۆرێ ئاوو دانیان دایێ
پێیان ووت ئێرە جێگەتە
....... تا هەتایێ!
بولبول ناچار ........
لە دووری گوڵزارو بەهار
نارەزایی خۆی دەربڕی
مان گرتنی بردەسەری
بە دەنووکی بێ نازی خۆی
دەنکێ دانی خستە ناو شێ
چاوە نوارەما بەئاخ و ئۆی
بەڵکو گوڵ بێتە باوشێ!
شەوگار کەوتە دوای شەوگار
هەتا سونبول کەوتە ڕۆژگار
لەو کاتەوە......
بەهاری نوێی هاتەوە
هێندەی ئاوازەی خۆش هەڵرشت
هەتا داخی دڵی خۆی کوشت
سەری هەموویانی گێژ کرد
هەتاکو مرد!
ئەزانن دووا هەناسەی
لەنجەی شەپۆڵی پڕ تاسەی
چی ئەگوت لەم بانگەوازە!
چی هەڵ ئەرشت بەئاوازە!
ئەی گوت ئێوە کە زۆر زانن
بۆ چی تا ئێستا نازانن
لەخاکی ئەم کوردستانە
هەموو ڕێیەك دەچێتەوە
شاری بانە!
هەموو ڕێیەك دەچێتەوە
شاری بانە!!!

●

جلال مدحت خۆشناو
هەولێر ٢٤/٥/١٩٨٠

●

# پێنج خشتەکی‌یەکی بڵاونەکراوەی

# «ویصالی»

صلاح الدین عبدالقادر ـ سلێمانی

چەند ساڵێك لەمەوبەر لەناو هەندێ پارچە دەستنوسی کۆنی باوکم‌دا[1] پێنج خشتەکی‌یەکی نایابم کەوتە بەردەست ، کە بە خەتی شکستەی فارسی نوسراوەتەوەو وە لە سەرەوەی نوسراوە (کلام شیخ محمد قرەداغی) .

پاش ئەوەی بەوردی سەرجەمی شیعرەکەم خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە یەکێکە لە پێنج خشتەکی‌یە بەسۆزەکانی شاعیری خواڵێ خۆشبوو مامۆستا شێخ محمدی قەرەداغی کە نازناوی شیعری (ویصالی) بووە ، و دیوانەکەی لە لایەن کاك (جمال محمد محمد أمین) ەوە لە ساڵی ١٩٨٦ دا چاپکراوە .

سەرجەمی دیوانەکەم پشکنی ئەم پێنج خشتەکیەم نەکەوتە بەرچاو . تا ئێستاش لە هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێکدا نەمدیوە بڵاوکرابێتەوە .

بە پێویستی دەزانم بڵاوی بکەمەوە بۆ ئەوەی دیدەی خوێنەرانی پێ ڕۆشن بێتەوەو لە چاپی دووهەمی دیوانی ویصالیشدا لە ناو شیعرەکانی کەیدا بڵاوبکرێتەوە .

لەسەرەتادا کەمێك دەربارەی دەستنوسەکەو شیعرەکە ئەدوێم :

ئەم پێنج خشتەکی‌یە لە دوو لاپەڕەی زەردی کۆندا بە خەتی شکستەی فارسی نوسراوەتەوە ، وە لە سەرەتادا نوسراوە (کلام شیخ محمد قرەداغی) لە کۆتاییشدا بە فارسی نوسراوە :

تەواو بوو بە دەستی فەقیری حەقیر سەراپا کە موکوڕی (محمود موفق زادە) لە شاری سابلاغ بۆ سید عبد القادر) . لە سەرو ئەمەشەوە مێژووی نوسینەوەی پێوەیە کە نوسراوە ١٣٤٣ .

بەم نوسینانەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە محمودی موفق زادە ئەم شیعرەی لە شاری سابلاغ لە ساڵی ١٣٤٣ کۆچی‌دا بۆ باوکم نوسیوەتەوە ، وە ئەو ساڵە بەرامبەر ساڵانی ١٩٢٤ یا ١٩٢٥ی زایینی‌دا .

ماوەتەوە ئەوە بڵێین مەحمود موفق زادە کێ‌یە ؟

لە بارەی ناوبراودوەوکانی نوسینی ئەم پێنج خشتەکی‌یە باوکم بۆی گێڕامەوەو فەرمووی :

لەو ساڵەدا (١٣٤٣ی کۆچی) لە شاری سابلاغ (مهاباد) لە مزگەوتی هەباس ئاغا سوختە بووم . کتێبی (تەصریفی مەلا عەلی)م ئەخوێند لای مەلا ئەحمەدی دەرگا سلێمان ، ئەو محمودەش کوڕی موفق شاری سابلاغ بوو ، لەو کاتەدا کتێبی (جامی) ئەخوێند ، ڕۆژێکیان ئەم پێنج خشتەکی‌یەی ویصالی بۆ نوسیمەوە . ئەو کاتە (ویصالی) مەلا بوو لە دێی (باسنێ) . (لێرەدا قسەکانی باوکم تەواو) .

ئەگەر سەرنجێکی وورد بدەین لەم شیعرە بۆمان دەردەکەوێت کە شاعیر لەکاتی فەقێیەتیدا ئەم شیعرەی داناوە ، وە هەروەکو لە باوکمم بیستووە کە شاعیر لە کاتی نەخۆشی‌داو لە سەردەمی فەقێیەتیدا لە ناوچەی ئالانی نزیك پشدەر ئەم شیعرەی داناوە . ئەمەش پێنج خشتەکی یەکەیە :

(یا رسول الله) زەلیل‌و دڵفیگارم ڕەحمەتێ[2]
حامیلی باری گوناهو شەرمەسارم ڕەحمەتێ
تەن عەلیل‌و ئوفتادە بێ قەرارم ڕەحمەتێ
بێ ڕەفیق‌و یارو یاوەر ، دڵ غوبارم ڕەحمەتێ
دائیمە بۆ تابی لوطفت ئینتیظارم ڕەحمەتێ[3]

(یا رسول الله) بە تۆپی غەم قەڵای عەیشم شکا
تابی عیصمەت چوو بە جارێ ، ناری عیصیان هەڵگرا
کۆڵەکەی عومرم ضەعیف بوو ، خانەیی جیسمم ڕووخا
گەوهەری صەبرو شەکیبم کەوتە نێو بەحری فەنا
شێت‌و شەیداوو غەریبی دەردی یارم ڕەحمەتێ

(یا رسول الله) لە بێدەروێ دەناڵێنم زەلیل
گومڕەهی هامونو باسکی چۆڵی شلەاشم دەخیل[4]
دڵ پەرێشانم ، ئەوا کەوتووم لەژێر جێدا عەلیل
ساوەرە ڕەحمێ بکە بە منی فەقیری زەلیل
زۆر ضەعیف‌و عاجزم هەم لێوبەرم ڕەحمەتێ
تەن وەکو کەو کونکونە جانا لەبۆ ناری غەمت[5]
دڵ وەکو بولبول بەناڵینە لەبۆ غونچەی دەمت
ڕۆح وەکو پەروانە حەیرانە لە دەورانی شەمت

بم به قوربانی زەنەخدانی لەبێ جامی جمت
من کەوا سووتاوی ناری عەشقی یارم ڕەحمەتێ

لەشکری پەشمو مەگەس لێم کۆبوونەوە جەمعەن بە کین
تەن بە زەردی وا لە مەیدان کەوتووە وەك ئەنگەبین[6]
لێفە وەك هەوری غەزەب پۆش لە من ڕووی سەر
زەمین
کەس نیە لەم وەقتەدا ناجی لە بۆ قەلبی حەزین
یا نەبی هەر تۆی موعینم زۆر بەزارم ڕەحمەتێ[7]

(یا رسول الله) بە قوربان غەرقی خوونی عیللەتم[8]
موستەحەقم ئاری گەر دوچاری دەردو زیللەتم[9]
لێك چونکە بێ نەواوو بێکەس و بێ قوورەتم[10]
غەیری لوطفی تۆ نەبێ دافیع نیە بۆ میحنەتم
باعیثی دنیاو دین و ئیعتبارم ڕەحمەتێ

(یا رسول اللە) گوناهم زۆرە وەك ڕەملی بیحار[11]
باعیثی جورمی منە غالب بووە جەمعی کوفار
نەفس و شەیطان وا لەسەر من غالبن وەك کەلبی هار

● پێنج خشتەکی «ویصالی» بەخەتی محمود موفتی زادە

یەك دەقیقە میثلی بەندی نیمە ئەصلاً ئیختیار
مورشیدی ڕاهی یەقین ، غەمگوسارم ڕەحمەتێ

(یا رسول الله) حەزینم میثلی مەجنون ڕۆژو شەب[13]
عاشقی ئان زوڵفی مشکینم لە شاماتو حەلەب[13]
تەیری دڵ شەیدایە بۆ بستەی دەهانو قەندی لەب[14]
مەستو داماوو خەمۆشم نیمە ئەسبابی طەرەب[15]
تۆی پەناهی بێ نەوایان ، ئەشکبارم ڕەحمەتێ

ڕۆژی ئەووەڵ دینەکەم چوو بۆ خەمی زوڵفەینی تۆ
چاوەکەم کوێر بوو لە هیجری خاکی‌ی نەعلەینی تۆ
دڵ بریندارە بە تیری ئەبرۆیی قەوسەینی تۆ
جانی سالیك ئارەزومەندە لە بۆ عەینەینی تۆ
وەقتی ئەلطافە چراغی بەیتی تارم ڕەحمەتێ[16]

گەر دەپرسی حاڵەتی من چۆنە ئەی فەخری جیهان
جانی کەهوارەی بەدەن قرتا بە دەسرازەی ژیان
وەقتە وەك طەیری قەفەس پەرواز بکا بۆ ئاسمان
بێ بە فەریادم کەسیفم ، قاسمی حۆری جینان
قووەی پشتو طەبیبی دەردو زارم ڕەحمەتێ[17]

من کە هەرچەندە ئەسیری نەفسی پیس ئەعوەرم
هەروەکو دز شەرمەسارو ڕوسیاو بێ ڕەهبەرم
هەر ئەوەندەم کافیە گەر ئومەتی پێغەمبەرم
دەربەدەر کەوتم لە خزمو ئوفتادەی پشدەرم[18]
ئەی ئومێدی ئەهلی ئیمان ، دەردەدارم ڕەحمەتێ

ئەرزی ڕوو گرژو عەبوسە ، هەروەکو شیر ترشو تاڵ
وەك جەهەنەم پڕ لە مارە لایقە بۆ جێ‌ی دەجال
شیوی گەرمە پڕ لە نارە دارو بەردی وەك زوخاڵ
بەحثی ناسازی مەحاڵە بێتە مەیدانی مەقال
یا محمد زۆر زەلیلو خاکەسارم ڕەحمەتێ[19]

(یا رسول الله) ویصالی عەیش زەرتگە زەردی کرد[20]
جێگەیەکە گەرمو ناخۆش پڕ لە تۆزو چقڵو بەرد
مەوقیعێك قەبضو موهەللیك لێ‌ی نەماوە عەیشی
مەرد
دایمەن هەر ناڵە ناڵە هەر هەڵکێشان ئاهی سەرد
مەرحەمەتکە میثلی فەرهاد غەمگوسارم ڕەحمەتێ

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم بڵێم : لە ساڵی ١٩٨٨دا ئەم پێنج خشتەکیەم نارد بۆ گۆڤاری (بەیان) ، بەڵام تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە ، دوای ٣ ساڵ چاوەڕوانی دڵنیام لەوەی کە لە گۆڤاری ناوبراودا بڵاو ناکرێتەوە ، بۆیە کردم بە دیاری بۆ ئەم گۆڤارە دڵگیرە (گۆڤاری کاروان) .

پەراوێزەکان

(١) باوکم خوالێ‌ی خۆش بێ ناوی مەلا سەعید عبد القادری واعیظە کوڕی مەلا سەعید حەسەنە ، لە ساڵی ١٩١٢ زدا لە دایك بووە ، سەرەتا لە حوجرەی فەقێیاندا دەستی بە خوێندنی زانستە ئیسلامی‌یەکان کردووە ، بۆ بەدەستهێنانی زانیاری زۆر شارو دێهاتی کوردستان گەڕاوە ، تا لە ساڵی ١٩٣٧ دا ئیجازەی عیلمی لە خزمەت مەلا ئەحمەدی هەولێردا وەرگرتووە ، پاشان چەند ساڵێك مەلایەتی کردووەو ٧ ساڵیش مامۆستای قوتابخانە بووە ، تا لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٥-٤-١٩٩١ دا گیانی پاکی بە یەزدان سپارد . داخەکەم مەرگ مۆڵەتی نەدا ئەم پێنج خشتەکی‌یە ببینێ لەم گۆڤارەدا بڵاوکرایەوە .

٢) دڵفیگار : دڵگوشراوو دڵ ناڕەحەت .

(٣) ئاب : ئاو ، لوطف : ڕەحمو سۆز .

(٤) : دێیەکە لە ناوچەی سەردەشت لە کوردستانی ئێران .

(٥) کەو : هەروەکو (پێژنگ) وایە بەڵام ئەم بۆ لە کەودانی ئۆڵەو پاقلە بەکار دەهێنرێت .

(٦) لەنگەبەین : هەنگوین .

(٧) نازانم لێرەدا شاعیر بۆچی قافیەی کۆتایی پێنج خشتەکیەکەی لە بیر چووەو یەکێتی قافیەی تیادا بەکار نەهێناوە ؟

چونکە (نەزانم) لەگەڵ قافیەکانی‌تردا ڕێنا کەوێ .

(٨) خروون : خوێن ، عیلەت : دەرد

(٩) ئاری : بەڵێ .

(١٠) لیك : کورت کراوەی (لکن)‌ی عەرەبی‌یە کە بەمانای بەڵام - هاتووە .

(١١) ڕەمل : لم

(١٢) حەزین : دڵتەنگ ، شەب : شەو

(١٣) شاماتو حەلەب : شاعیر لێرەدا زوڵفی یارەکەی شوبهاندووە بە شامات . کە دوو مانای هەیە یەکەم ئەو کاتەی ویصالی ئەم شیعرەی داناوە بە وڵاتانی سوریاو لوبنانو چەند وڵاتێکی تر وتراوە (شام) . دووەم : شام واتە کاتی ئێوارەو خۆرئاوابوون کە دنیا تاریك دادێت .

حەلەب : شارێکە لە سوریا ، ویصالی لەبەر قافیە ناوی ئەم شارەی هێناوە ئەگینا هیچ پەیوەندی‌یەکی بە شیعرەکەوە نی‌یە .

(١٤) بستەی دەهان : ددانی وەك نوقڵو چوکلێت ، قەند : شەکر . لەب : لێو

(١٥) طەرەب : خۆشی‌و شادی

(١٦) چراغ : چرا ، تار : تاریك

(١٧) زارم : لە دەستنوسەکەدا (ڕازم) بوو بەڵام بێگومان هەڵەیە چونکە لەگەڵ دوا قافیەی پێنج خشتەکیەکانی تردا ناگونجێتو ڕێنا کەوێت .

(١٨) وەکو لەسەرەتادا ڕوونم کردەوە شاعیر لە ناوچەی ئالانی نزیك پشدەر ئەم شیعرەی داناوە .

(١٩) لە دەستنوسەکەدا ئەم پێنج خشتەکی‌یە لە کۆتایی‌دایە بەڵام لەبەر ئەوەی نازناوی شاعیر (ویصالی) لە پێنج خشتەکی دواهەمدایە ، ئەو پێنج خشتەکیەمان خستەدواوە

(٢٠) دیارە شاعیر لەو دێیە توشی ئەو نەخۆشی‌یە بووەو بەم پێنج خشتەکیانە لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پاڕاوەتەوەو سکاڵای دڵی خۆی لە لا کردووە .

١٩٩١/٨/٥

## کاته سرکه‌کان

هه‌ولێر : مصطفی زه‌نگنه

کاتێ لێوم
له‌سه‌ر سینگت
شوێن هه‌وارێ
به‌جێ دێڵێ
جرای چاوم
وه‌ك تیشکی سوزی ناوه‌وم
دونیای جوانی . .
له‌شی نه‌رمت . .
به‌ ئاورێك گشت ئه‌کێڵێ
تینی ئه‌مه‌ن
له‌وێدا کۆئه‌بێته‌وه‌
کێڵی به‌رزی خه‌ونیکی تر
ئه‌بێته‌ به‌ور
دڵۆپ دڵۆپ ئه‌تۆێته‌وه‌
کاتێ ده‌ستمان ئه‌گاته‌یه‌ك
په‌نجه‌کانمان تێك گیرئه‌بن
پێڵوه‌کانم
رائه‌وه‌ستن
تۆماکانی ئه‌ندێشه‌وه‌ه‌ست
تێکه‌ڵ به‌گۆمی بیر ئه‌بن
کات مرك ئه‌بێ‌و تێژه‌و ئه‌بێ
زامێکی دی
خه‌میکی دی
تووشی وه‌نه‌وزی خه‌و ئه‌بێ
به‌پری دڵ
حه‌ز ئه‌که‌م تێرتێر بتگوشم
له‌گه‌ڵ هه‌موو هه‌نیسکێکا
هه‌لاڵه‌ی بالای گوڵ گوڵێت
به‌ ئه‌ندازه‌ی جوانیکانت
هه‌ڵ بێژم .

## تاشه به‌رد

عبد الرحمن فه‌رهادی

١ مه‌رگ
مه‌رگ ده‌ستی له‌ بینه قاقای شیعرێك نا
شیعره خۆی له‌ ده‌ست ڕاپسکاند ،
په‌له‌ قاژه‌ی شیعره‌و زه‌برو زه‌نگی مه‌رگ
سنووری بێ ده‌نگی‌یان شکاند . .
که‌ شیعره قیره‌ی لێ برا
مه‌رگ ده‌ستی له‌ ئه‌وکێ به‌ردا !
هه‌ر ئه‌و ده‌مای شاعیرێکیش
لێی ڕاست بۆوه‌و
له‌ شیعرێکیا ئاگری له‌ مه‌رگ به‌ردا ! !

٢ - په‌نا هه‌نده . .
تاڵه‌ مووێ
خۆی نه‌دایه‌ ده‌ست مووکێشێ
ڕۆی په‌نای برده‌ به‌ر گوێزان :
«ڕێگه‌ به‌م مووکیشه مه‌ده‌
له‌ ڕه‌گه‌وه‌ هه‌ڵمکێشێ !

٣ - به‌رد . . .
ئه‌م به‌رده زله‌ش
دوا ڕۆژو ڕابردووی هه‌یه‌
کێ ده‌ڵێ ڕۆژێ نابێته‌
سه‌کۆی ڕێبوارێکی لاڕێ ؟ !
یاخود نابێته‌
سه‌رینه‌ ڕه‌قه‌ی جه‌سته‌ی نازدارێ !
خۆ ده‌شێ پارچه‌ . . پارچه‌ لێکی که‌ن

پارچەیەکی لێ بێ بە خشتی شینە دیوارێ
پارچەیەکی کەی .
ئاراستە کرێتە سەرکی زۆرداریێ ؟

**٤ – تاشە بەرد . . .**

لەم تاشە بەردە زێتر شلك نابەم
تا ئیمشەو بۆ خۆم .
بیکەم بە سەرین !
رەنگە سبەینێ هەمان تاشە بەرد
بکەن بە کێلێ بۆ گۆری منی
شەهیدی گوڵو . . فرمێسكو . . ئەوین .

**٥ – (            )**

ئاسمان لە چیا تورە دەبێ
لەپڕ کفن پۆشی دەکا

کەچی چیا کفن درێکی سەر سەختە
گشت ساڵێ جارێ لەم وەختە
لە نێوانی ڕکابەری ئاسمان و چیا
بەهارێ نوێ سەر هەڵەدا !!

**٦ – یەکگرتن**

دوو دار لە تەنیشت یەکا بوون
کە لقەکانیان تێك ئالا
توانیان
بالای خەمی یەکتر فڕ کەن . .
ڕۆژگار هاتو . . ڕۆژگار ڕۆی ،
ئەم دوو درەختە توند یەکیان گرتو
بوونە شادرەخت لە دارستانا . .
هەرچی تەوری ئەم دنیایەیە
هیچ نەدەوێران
گوزەرێ بکەن . . بە نیشتیانا !



کۆفان ئەکرەم – هەولێر

# هەشت پارچە شیعری کورت

**دوو گرمۆ**

• دوو بورژوا
لە سەر جوانێ ، وارێك کەوتن
بیست هەزاریان . . . !!
بۆ گرمۆ دانا
دوو شاعیریش
لەسەر شیعرێ
خونچە گوڵێکی بەهاریان
بۆ گرمۆ دانا

**ناحەق**

• بۆ قومێ ئاو
مامەی ریش سپی روحی‌دا
• لە سەر گۆڕەکەی نووسیان
کەوتە دەریایێکی قووڵو ،
مەلەی نەدەزانی ، لە ئەنجامدا خنکا

**پێشت**

بۆ پێست ڕەشانی ئەفریقا
لەبەر دەم دادگا بەهاوار . . . !!
پارامەوە
رژانە سەرم وەك باران
بەتاوان باریان دانامو
سزا . . پێستی سپیان لە لەشم کردەوە

**شاعیر**

لەلایەن چەند گەورە پیاوێ
لەسەر مێزێکی بارا . . !!
مژدەی مەرگی
شاعیرێکی هەژارو لاو
بو بە خەندەو لەسەر لێویان وەك گوڵ ڕوا
بۆ بەیانی
لەسەر شانۆ
هەمان دەوری ئەم شاعیرە ، پێش‌کەش کرا
هەر گەورە پیاوی جاران بوون
کە چەپڵەی ئافەرینیان بۆ لێ ئەدا

**دادگا**

• ناو . . . . لەمەکداری زەمانە
• تەمەن . . . . ڕوباری سیروانە
• ژینت . . . . لەناو زنوێرانە
• هیوات . . . . خۆشی هەژارانە
• خاکت . . . . مەنزلگای بەفرانە
• قینت . . . . هەموو بۆرژواکانە

**مێژوو**

ئەمیان مێژوو
پێکی ژەهراوی دەرخوارد دا . . !!
تاوان کردی
بەرەشەبای زەوی‌و ئاسمان
رانەگیرا ,. ڕانەگیرا
تا بتوانێ . . .
دەنگ هەڵ بڕێ
تا مێژووی خۆی
خۆی بنووسێ

**سنور**

سنووری خاکمان
بۆ هەموو کەسێ والایە
ئاگادار بن . . . ! ؟
حەق . . . سەربەستی
لە خاکماندا
بە هەزار کلیل گەورە
قفل درایە

**دەرگا**

• سەدەیێکە . .
ئەم دەرگایە ، بۆم والایە
• ئیمڕۆ هاتم ، کە سەیرم کرد . . !!
هێسك ، ددان
کەللەو چاوی
هەزار مرۆی ، تیا جێمایە

●



بەشێک لە:

# «ساڵی بەفر و خوێنی شیعر»


عبدالمطلب عبدالله
١٩٨٦/ هەولێر


کاتێک مەرگ..
دەست دەنێتە هەوکی خۆزگەی
ئەستێرەی بەری بەیانم
فرمێسکی سووری کۆرپەی دڵ
دادەچۆڕێ بۆ سەر کوڵی،
سیس و زەردی شیعرەکانم!.

(١)

نیوە شەوێ..
کەی لەناو خامۆشیدا سەمای دەکرد
ئازار هەر خۆی پاڵەوانی تەنیایی بوو
شۆڕ دەبۆوە
بۆ ناو گەرووی برینەکان.
ئلواتەکان..
بووکە بەفرینەی بەر خۆر بوون
لەژێر هەرەسی لەش دابوون
لەشیش لە ژێر دونیا دابوو.

(٢)

بێزاریت و
بێزاری هەڵت دەلوشی
تۆش وەک بادە دەیخۆیتەوە.
بێزاریت و
بێزاری وەک باڵندەیەک
خۆی لە باڵەخانەی مێشکی
تۆ دەکوتی.

(٣)

سەرت وێڵی خەونە سەرەڕۆیەکان بوو.
بەهەنگاوە تووڕەکانت
دڵی بەفری
ڕێبەندانی زستانی پڕ چاوەڕوانیت
دەبەستاوە
وەک مەرێکی بە ساڵا چوو
لەشەوێکی کپ و خامۆش
خرمەی کاوێژی هەنگاوت
دەگەییە هۆش!.

● شەو تا دەهات ماتتر دەبوو
لە چاوی ڕەشی پڕ کلی
کیژێکی هەورەمان دەچوو
لەتاریکی شەوی بەدیووم
ئەسپی خەیاڵ کەوتە نێسکە
هێدی.. هێدی
بە بناری زامەکانا چویتە خوارێ.

★ ★ ★

● شەو تا دەهات ماتتر دەبوو
بەناخی خەمێکی چڕو
بە دەریایەکی مەنگ دەچوو
ژان و سکاڵای جیهانی
لە چاواندا حەشار دابوو
جار نا جارێ ـ خشپە.. خشپی
«شەماڵی وێڵ و سەرگەردان
شا دەنگی شەوی مەرگت بوو».
گوێچکەی خامۆشی دەبزوان.

● شەو تا دەهات ماتتر دەبوو
لە ڕوخساری مرۆڤێکی ڕەش
پێست دەچوو
ناخی دڵ و دەروونی تۆ
«لەتەمێکی تەڵخ دەچوو»
برینی کەنیوی دڵت
«کێمی ڕقی دەردەپەڕان».

★ ★ ★

١٩٨٦/ هەولێر

○

# سروودی باران

شیعری: بدر شاکر السیاب
وەرگێڕانی: لطیف محمد حسن

وتەیەك :

«سروودی باران» یەکێکە لە شاکارەکانی شاعیری بە ناوبانگ (بدر شاکر السیاب ١٩٢٦ – ١٩٦٤ز) ، کە یەکێکە لە هەڵگرانی ئاڵای نوێ کاری لە شیعری عەرەبی هاوچەرخدا ، بۆیە ناتوانین بە چەند دێرێك ئەم هۆنراوەیە هەڵسەنگێنین و هەڵوێستێکی رەخنەیی بەرامبەری نیشان بدەین . . تەنیا ئەوەندە ئەڵێین لێرەدا «باران» تەوەرەیەکەو وەك هێمایەك گەلێ واتا لەچەند وێنەیەکی شیعری چڕو پڕدا لە دەوری خۆی کۆ ئەکاتەوە ، دەبینین هێشتا شاعیر لە وێنەیەك نەبۆتەوە وێنەیەکی دی تێهەڵکێش ئەکات ، لە گەڵ ئەوەی کە زۆربەی ئەو دیمەنانەی ئەم وێنانە دەری ئەخەن دیمەنی پڕ ئێش و ئازارو ترسناکن بەڵام شاعیر بەهۆیانەوە پاشەرۆژێکی روناك بۆ گەل ئەکێشێت ، پاشە رۆژێك کە تیایا بەرهەمی «باران» چاو برسی و ورگنەکان نەیچننەوە ، بەڵکو «باران» بێتە گوڵی زەردو سوور ، بێتە کانی شیر لە دوو لێوی کۆرپەکاندا بتەقێتەوە ، جا ئێوەی ئازیز و دەقی هۆنراوەکە :

– وەرگێر –

چاوەکانت
دوو دارستانی دار خورمان
دەمەو بەیان
دوو بانیژەن ،
وا مانگ لێیان ئاوا ئەبێ
چاوەکانت پێ ئەکەنن
چرۆی رەزەکان ئەپشکوێ
پرشنگ وەك مانگ لە رووباردا
کاتێ سەوڵ بە ئەسپایی
ئەیزوێنێ بەری بەیان

دێتەسەما
لە قووڵایی چاوەکانتا
ئەستێرەکان ئەجریوێنن
نوقم ئەبن لەتەمی خەمێکی رووندا
وەك دەریایەك
ئێوارە وەخت
دەستی خۆی کێشێ بەسەردا

گەرمی زستان ، لە رزی پایز
تاریك و روون ، مەرگ و زایین
لە ناخیایە
پڕ بە رۆحم
کوڵی گریان ئەهەژێنێ
حەزی کێوێم
وەکو حەزی منداڵێکی لە مانگ ترساو
دەست لە مل ئاسمان ئەکات
ئەڵێی پەلکە زێڕینەیەو هەور ئەنخوات
تنۆك ، تنۆك لە باراندا ئەتوێتەوە

منداڵەکان لە ژێر کەپری رەزەکاندا
کەوتنە هەرا ،
نەوای باران
ختوکەی بۆلە چۆلەکەی کش و مات
سەرلق و پۆپی دارەکان ئەدات
بارانەو . . . .
بارانەو . . .

باران . . .
ئێوارە وا وەنەوز ئەدات
هەور هێشتا
هەرچی فرمێسکی درشتە ئەیڕژێنێ
وەك منداڵێك بەرلەنوستن
بە دایکیەوە ورێنەکات
واساڵێکە ئەفامێت و بوی ئەگەرێت
هەرچەندی کرد نەیبینیەوە
کاتێ ورکی گرت بۆ دایکی
وتیان : دوو سبەی دێتەوە
دایکت هەر ئەبێ بێتەوە ! !
هەرچەند هاورێکانی بەچرپەچرپ وتیان :
وا لەوێیە . لەقەد پاڵی ئەو گردەدا
«نوستنی گۆڕ» لێی نوستووە
گڵی گۆڕ و باران ئەخوات
وەك راوکەرێکی رەنج خەسار
تۆرەکان ئەپێچێتەوە
نەفرەت لە دەریاو قەدەری ! !
کاتێ کە مانگ لێی ئاوا بوو
گۆرانی خۆیی لێ ئەڵێ :
باران . . .
باران . . .
ئەی کیژ : تۆ ئەزانی باران،
چ ئازارێك ئەهەژێنێ ؟ !
تۆ ئەزانی کە پلوسکە چۆڕاو گەی بەست
بە چ ئێشێك ئەناڵێنێ !
تۆ نەزانی کەسی تەنیا
چۆن گوم بوونی تیا ئەبینێ ؟
بێ کۆتایی
– وەك خوێناوە ،
وەك برسیان ، دانەوێڵە ،
وەك منداڵان ، مردووانە
ئەو بارانە . . .

چاوەکانت لەگەڵ باران گێژم ئەدەن
بەسەر شەپۆلی کەنداودا
برووسکە کەناری عێراق
بە ئەستێرەو گوێچکە ماسی ئەشواتەوە

٠٠کو بلیٚی ، چاوەکانت
ـحەیْ سور هەلْگەرِێن
ـەر تارای خوێن بەسەریانا ڕائەکێشیْ
ـگمو‌ز لە کەندار ئەکەم :
ـی کەنداو :
ـەی ـەخشـەری کوێچکە ماسی‌و مرواری و مەرگ
ـەی دەنگەکەم دێتەوە
ـەڵێ دەنگێکی خنکاوە . .
ـەی کەنداو ،
ـەی ـەخشـەری گوێ‌ماسی‌و مەرگ،
ـەـ لیٚیە عێراق خەریکە
ـەی هەور کوگا ئەکا
ـەشوری برووسکەی لیٚ ئەخا
ـەر چیاو لەپیٚ دەشتا
ـە نوشووی تەواوی لیٚخست
ـەب ئەیداتە دەست پیاوان
ـ هۆزی سەخت
ـەر دۆڵەدا
هیچی لە «ئمود» جیٚ نەهێشت
ـەـ لە نرکەو نالە نالّی گوندەکانە
ـەچکمرەکان بەسەول‌و چاروکەکانیان
ـەنگارِی گەردەلوول‌و گرمەگرمی هەور ئەکەن
ـرووده‌کەی
ـاران . . .
باران . . .
باران، ئەڵێن
ـە عێراقدا برسێتی یە ،
وەرزی دوورینە دەغل‌ودان ئەپرژێنیٚ
کونەو قەلەرەش تێر ئەکات
ـە کێڵگەکاندا بەرداشێك ئەخولێتەوە
عەمار و بەردیش ئەهاریٚ
ـەدەوریا مرۆ :
باران . . .
باران . . .
باران . . . ،
ئەو شەوەی کوچمان تیا کرد چەند فرمێسکمان ڕشت
ـە ترسی‌تانە دوای ئەوە

بە باران لیٚی ئەخوش کەوتین
باران . . .
باران . . .
باران . . .
لەو کاتەوەی کە منداڵین
هەموو ساڵیك لە زستاندا
هەور ئاسمان ئەگرێتەوە
ئەبێتە ڕەهێڵەی باران . .
زەوی شین ئەبیٚ ، برسیانە
ساڵیٚ ئەرِوی ، عێراق برسێتی تیانەبیٚ . .
بارانەو . .
بارانەو . . .
باران . . .
لەهەر دلۆپە بارانیٚ
کورپەی زەردو سووری گوڵیٚ
هەر فرمێسکیٚ لە برسی‌و ڕووتەکان ئەرژیٚ
هەر دلۆپیٚ لە خوێنیٚ کویلەکان ، ئەتکیٚ
خەندەیەکە ، چاوەڕوانە
بۆ خەندەی لێوێکی تازە
گۆی مەمکێکە سوور هەڵگەڕاو
لە دنیای تازە بەخشی ژین
دەمی کورپەیەك ئەیمژیٚ
بارانەو . .
بارانەو . . .
باران . . .
عێراق بە باران سەوز ئەبێت
بانگەواز لە کەنداو ئەکەم :
ئەی کەنداو ،
ئەی بەخشـەری گوێچکە ماسی‌و مرواری و مەرگ

دەنگ دێتەوە
ئەڵیٚی دەنگێکی خنکاوە
«ئەی کەنداو
ئەی بەخشـەری گویٚ ماسی و مەرگ
کەنداو ، لەسەر تەختی لمی ڕووی کەناری
هەرچی هەیە هەڵی ئەرژیٚ ،
کەف خوێی تاڵ ، گوێچکە ماسی
چڵ‌و چێویٚ کە جیٚماوە ،
لە هەزارێکی خنکاوی کوچەرەکان
هەر وەکو خوێ
لە قوڵایی کەنداودا مەرگ ئەخواتەوە
لە عێراقدا هەزاران مار
شیلەی گوڵیٚ ئەخۆنەوە
بە ئاونگی فورات ئەروێ
گوێم لەسەدای کەنداوە ئەزرنگێتەوە
بارانەو . .
بارانەو . . .
باران . . .
لە هەر تنۆکە بارانیٚ
کورپەی زەردو سووری گوڵیٚ
هەر فرمێسکی لە برسی و ڕووتەکان ئەرژیٚ ،
هەر دلۆپیٚ لە خوێنی کوبلەکان ئەتکیٚ ،
خەندەیەکە ، چاوەڕوانە
بۆ خەندەی لێوێکی تازە ،
گۆی مەمکێکە سوور هەڵگەڕاو
لە دنیای تازە بەخشی ژین
لێوی کورپەیەك ئەیمژیٚ ،
بارانەو . .
ئەباریٚ باران . .

. هەرچەند وشەی (بانیژە) دەقاو دەق مانای (شرفە) عەرەبی‌یەکە نابەخشێت . بەڵام بە نزیکترین وشەم زانی چونکە مانای بەرزی قاتی دووهەم ئەگەیەنی و لە هەمان کاتدا وەك (شرفە) ئەکەوێتە بەردەم هۆدەکانی خانو ، جگە لەرەسەنی وشەکە لە کوردیدا .

.. ئەلێ وشەی (کەنداو) لە خوێندنەوەدا درێژ ئەکرێتەوە هەم جوانی گوێمان لەگەڵ هاوار گردنو دەنگ دانەوەکەشیدا دروست ئەکات و هەم ئەبێتە هۆی تەواو کردنی بڕگەکانی دێرەکە .



جیهانی چیرۆك

**چیرۆکی : سەمەدی بەهرەنگی**

**وەرگێرانی : محمد حسن رۆژبەیانی**

پیرێژنێك هەبوو لە دارایی دنیادا تەنها جووجەڵەیەکی زەردی شلك دەبرد ، ئەم جووجەڵەیەشی شەوێك لە خەودا گرتبوو . پیرێژن لفکەی دەچنی و لە بەردەم گەرماوەکاندا دەیفرۆشت . جووجەڵە زەردەش لەناو کەلاوەکەی پیرێژندا مێروولەو جاڵجاڵۆکەی دەگرت و دەخوارد . لە ترسی جووجەڵە زەرد هیچ مێروولەیەك نەیدەوێرا ڕوو لە ماڵەکەی پیرەژن بکات . تەنانەت مێروولە گەورەو چایکەکانیش . چونکە جووجەڵە زەردە چاك و خراپی مێروولەکانی جودا نەدەکردەوە . بە یەك چاو تەماشای هەموویانی دەکردو بەر دەنووکیانی دەدا . تەنانەت ڕوو بەڕووی پشیلە چاو چنۆکەکانیش دەبۆوە . کە لە پێناو پارچە گۆشتێکدا هەموو شتێکیان تێك و لێك دەدا .

لە حەوشەکەی پیرەژندا دار گوێزێکی پڕ لق و گەڵا هەبوو ، کاتێ کە گوێز پێ دەگەیشت . جووجەڵە زەردە لە خۆشیاندا پێ‌ی زەوی نەدەگرت . «با» دەهات و لقەکانی دەهەژاندو گوێزی بەردەدایەوە . جووجەڵەش دەیشکاندو دەیخوارد .

جاڵجاڵۆکەیەکیش تەنهایی پیرەژنی بە هەلزانی بوو ، لەسەر ڕەفەو پشت کووپەڵەکانەوە تارو تەونی خۆی دەچنی و گەرای دەنایەوە . پیرەژن جاران لەو کووپەلانەدا سرکەو شەربەتی بەرسیلەو عەرەقی شا ئەسپرمی دەگرتەوەو بە پارەکەی خۆی بەڕێوەدەبرد . بەڵام ئێستا ئەنها لفکە دەچنی کووپەڵە ڕەنگاو ڕەنگەکانیش بە بەتاڵی ریز کرابوون .

جاڵجاڵۆکە کە هێجگار زۆر لە جووجەڵە زەردە دەترسا ، چونکە دەیزانی ڕۆژێ لە ڕۆژان گرفتاری دەنووکی ئەم جووجەڵەیە دەبێت ، بەتایبەتیش چەند جارێك جووجەڵەکە لەسەر ڕەفەکە بینیبەتی و هەڕەشەی لێکردووەو چەند زارووبەکیشی لووش‌داوە ، لە لایەکی تریشەوە جووجەڵە زەردە قڕی لە مێروولەکانی ناو ماڵەکە بریبوو ، ئەو مێروولانەش ئەو وورده شتانەیان کۆدەکردەوە کە پیرەژن لەسەر ڕەفەکەی دادەنان ، ڕێ‌ی هامشۆکردنیشیان پشت کووپەڵەکان بوو ، بۆ جاڵجاڵۆکەکەش ڕاوو شکارێکی چاك ساز دەبوو .

شەوێك جاڵجاڵۆکەکە چووە خەونی پیرەژن و پێ‌ی ووت :

– ئاگات لێ‌بە جووجەڵە بێ شەرمەکەت چۆن ماڵ و سامانەکەت پیرەژن ووتی زمانت بگرە ! جووجەڵە زەردەی من جووجەڵەیەکی بەنازو میهرەبانە ، هەرگیز کاری وا ناڕەوای لێ ناوەشێتەوە ؟

جاڵجاڵۆکە ووتی : دیارە زۆر سادەو بێ ئاگای تۆ وەکو کەو سەرت لە بەفر دەناخنی و خەیاڵێ خاو دەکەی پیرەژن بە توورەییەوە ووتی : ڕاست بڵێ بابزانم مەبەستت چی‌یە ؟

جاڵجاڵۆکە ووتی : سوودی چی‌یە ؟ جووجەڵە زەردە وەها چاوتی کوێر کردوو کە بە هیچ جۆرێ بە قسەی من باوەڕ ناکەی .

پیرەژن دیسان بە توورەییەوە ووتی :

– ئەگەر بەڵگەی چەسپاوت بەدەستەوەیە کە جووجەڵە زەردە ماڵ و سامانم بە فیڕۆ دەدات پێم بڵێ . بۆ ئەوەی کارێکی وای بەسەردا بێنم تەنانەت مێروولەکانیش بەزەییان پێ‌ی بێتەوە .

جاڵجاڵۆکەکە کاتێ کەزانی دڵی پیرەژن کرمێ بووە ووتی :

– کەواتە گوێ بگرە ، ئەی پیرەژنی بێچارە ، تۆ ڕۆژ تا ئێوارە لفکە دەچنی و لە بەردەم گەرماوەکاندا دەیان فرۆشیت ، بۆ ئەوەی پاروو نانێك پەیدا بکەیت زگی برسیتی پێ تێر بکەیت ، ئەم جووجەڵە بێ حەیاو شەرم و وورگنەش ڕۆژێ

ﻪﺧﻪﯾاڵی‌دا نایەت لەو هەموو گوێزە کەمێکت بۆ بهێڵێتەوە ، تابیان فرۆشیت‌و یەك ، دوو ڕۆژ بە ئارەزووی خۆت تێر نان بخۆیت . ئێستا بڕوات هات کە جووجەڵە زەردە دەیەوێ ماڵت وێران بکات ؟

پیرەژن پەست‌و تووڕە لە خەو ڕاپەڕی و نەخشەی بۆ تۆڵە سەندنەوە کێشا . سبەی بەیانی بۆ لفکە فرۆشتن نەچوو ، لە کەلاوەکە دانیشت‌و چاوی لە حەوشەو جووجەڵە زەردەبڕی ، ئەویش تازە لەخەو ڕابووو چاوەڕوانی دەرکەوتنی ڕۆژی دەکرد . جووجەڵە زەردە هاتە بن دار گوێزەکەوەو پێ‌ی ووت :

– ئەی درەختی هاوڕێم : یەك ، دووانێ باوێ خوارەوە تا قاوەڵتی پێ بکەم .

دار گوێزەکە یەکێ لە لقەکانی خۆی داتەکاندو چەند گوێزێکی گەییوی فڕێ دایە خوارەوە ، کاتێ کە جووجەڵە زەردە ویستی بەرەو گوێزەکان بڕوات پیرەژن لێ‌ی قیت بۆوەو هاواری کرد :

– ئەهای جووجەڵەی ڕەنگ زەرد ، نەکەی دەستیاز بۆ ببەی !

لەمەودوا ڕێ‌ی ئەوەت نادەم یەك‌دانە گوێز بخۆی .

جووجەڵە زەرد بەسەرسامیەوە تەماشایەکی پیرەژنی کرد ، پیرەژن . پیرەژنەکەی جاران نی‌یە ، چاوە پڕ لە ڕەزامەندی‌و میهرەبانەکانی ، ڕووە خۆش‌و بەخەندەکەی ، دەم‌و لێوو زمانە شیرنەکەی جارانی نەدی . نفقەی نەکردو لە جێ‌ی خۆی ڕاوەستا پیرەژن لێ‌ی نزیك بۆوەو شەقێکی تێ‌هەڵداو دووری خستەوە ، ئنجا گوێزەکانی کۆکردەوە خستنیە گیرفانیەوە . جووجەڵە زەردە سەرئەنجام هاتە قسەو ووتی :

– داپیرە ئەمڕۆ چیت لێ‌قەوماوە ؟ هەر دەڵێ‌ی ئەجنەدەت چۆتە پێستەوە . پیرەژن ووتی : بێ‌دەنگ بە ! . . زمان درێژی نەکەی . پێم ووتی ئیتر مافی ئەوەت نادەم گوێزی من بخۆی پێویستیم پێیانەو دەیان فرۆشم .

جووجەڵە زەردە سەری داخست‌و چوو لەبن دارەکە خۆی کز کرد . پیرەژن چووە ژوورەوەو ماوەیەکی پێ‌چوو . جووجەڵە هەڵساو بە دارەکەی ووت :

– ئەی هاوڕێ‌ی خۆشەویستم ، یەك ، دووانێکی‌تر بهاوە ، بابزانم ئەمجارەیان چی‌دەبێت . قاوەڵتی‌یەکەی ئەمڕۆی بە تەواوەتی لێ‌کردین بەژەهری مار .

دارەکە لقێکی دیکەی خۆی هەژاندو چەند گوێزێکی لێ کەوتە خوارەوە جووجەڵە خێرا خۆی پێ‌گەیاندن و ئاودیوی کردن .

لەم کاتەدا پیرەژن دەرکەوت‌و هاواری کرد :

هەی ڕەنگ زەرد هەرئێستا پیشانت دەدەم کە خواردنی گوێزەکانی من چی دەگەیەنێت ، پیرەژن ئەمەی ووت‌و چوو ئاگری مەقاڵەکەی خۆش کرد ، ئینجا هات‌و جووجەڵە زەردەی گرت‌و بەپشکۆیەکی ئاگر بن کلکی داغ کرد . دار گوێزەکەش لە حەیفاندا تەکانێکی داو کۆمەڵێ گوێزی بەسەرو کەللەی پیرەژندا بەرەڵڵا کرد ، بەڵام کاتی کە ویستی گوێزەکان خڕ بکاتەوە ، تەماشای کرد ، هەر هەمووی بەردە ، ئینجا تەماشایەکی دارەکەو جووجەڵە زەردەکەی کردو چوو لەکەلاوەکەی دانیشت .

جووجەڵە زەردەش لە کونجێکی حەوشەکە سەری خۆی خستە بن باڵیەوەو بەکزیەوە لێ‌ی دانیشت ، جار نەجارەش سەری دەردەهێناو تەماشایەکی جێ‌ی سووتانەکەی دەکردو بەنووکی باڵەکانی فرمێسکی چاوەکانی دەسڕیەوەو دیسانەوە خۆی گرمۆڵە دەکرد . پیرەژنیش چاوی بڕیبووە جووجەڵەکە .

دەورو بەری نیوەڕۆ «با» هەڵی کردو هەندێ گوێزی بەردایەوە . جووجەڵە لە جێ‌ی خۆی نەبزوا ، دیسان «با» هەڵی کردو گوێزی دیکەی بەردایەوە . جووجەڵە زەردە هەر نەجوولا ، تا دەمەو ئێوارە ئەوەندە گوێز کەوتە خوارەوە کە ئیتر جێگایەك لە حەوشەی پیرەژن نەما گوێزی لێ نەکەو تبێت .

پیرەژن ئەوەندە دڵ خۆش‌و شادمان بوو ، کە بە هیچ جۆرێ بیری لە جووجەڵە زەردەو سزاکەی نەدەکردەوە ، لەناکاو گوێی لە دەنگێك بوو کە دەیووت :

– ئەی پیرەژنی چاو نەترس وئازا جووجەڵە زەردەت لە پێ خست ئیتر چاوەڕێ‌ی چی دەکەی ؟ هەستە بڕۆ گوێزەکانت بفرۆشە .

وا ڕۆژ ئاوایەو تۆ تا ئێستا هیچت دەست نەکەوتووە ، پیرەژن سەری هەڵبڕی‌و جاڵجاڵۆکەیەکی گەورەی بەرچاو کەوت ، کە دەیویست لەرەفەکەوە بێتەخوارەوە ، لنگە کەوشەکەی تەنیشتی هەڵگرت‌و ڕپ‌و ڕاست لە جاڵجاڵۆکەکەی گرت . دەست بەجێ وێنەیەکی دیکەی جاڵجاڵۆکەکە لەسەر دیوارەکە نەخش بوو ، ئینجا پیرەژن بە گۆشەیەکی چاروگەکەی فرمێسکەکانی چاوی سڕیەوەو چوو بەلای جووجەڵە زەردەکەیەوە و پێ‌ی ووت .

جووجەلە زەردە پڕ نازو میهرەبانەکەم ، گوێزەکان وا لەبن پێتدا کەوتوون . ناتەوێ بیان شکێنی‌و بیان خۆیت ؟

جووجەڵە زەردە بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕی ووتی :

– ئەی پیرەژن لێم گەڕێ ، وازم لێ‌بێنە . تۆ نەبووی بن کلکت داغ کردم ؟

پیرەژن دەستی بەسەر جووجەڵە زەردەکەیدا هێناو دڵی دایەوە :

– جووجەڵە زەردە پڕ نازو میهرەبانەکەم ، گوێزەکان وا لەبن پێتدا کەوتوون . ناتەوێ بیان بشکێنی ویان خۆیت ؟

جووجەڵە زەردە ئەمجارە سەری هەڵبڕی‌و تەماشایەکی دەمو چاوی پیرەژنەی کرد ، هەمان چاوە پڕ لە ڕەزامەندی‌و میهرەبانی ، ڕوو خۆش‌و بەخەندەکەی ، دەمو لێوو زمانە شیرنەکەی جارانی بەدی‌کرد ، بۆیە ووتی :

– دادەگیان ، چۆن نامەوێ ؟ ئەی تۆ مەرهەم بە برینەکەمەوە دەکەی ؟

پیرەژن ووتی :

– چۆن مەرهەمی پێوە ناکەم ، ئەی جووجەڵەی پڕ نازو میهرەبانم هەستە بابڕۆینە ژوورەوە .

• • • • •

ئەوشەوە لەسەرخوانی پیرەژن و جووجەڵە زەردە تەنها کاکلە گوێز دانرابوو ، بەیانی هەرکە پیرەژن لەخەو ڕابوو هەرچی تاروتەونی جاڵجاڵۆکەی لە سووچ‌و قوژبنەکاندا بەرچاو کەوت . هەر هەمووی تەفرو توونا کرد .



● کورتە چیرۆك

# سێڤی ئالی سۆر

نورالدین انور بوتانی

رۆ ل‌بەر ئاڤا بوونێ بوو ، جۆتەك سۆلا لاستیکێ رەش دلنگی دابوو ، لێ ژ نۆزێ شەمەنتوێ هەو سپی دیار دکر . ئەگەر تە ل جلێن دبەر داژی نێری با . . تە دگۆ قەی ب دەوێ مالا (حاجیکێ کۆچەر) ب دەما بوهارێ هاتی‌یە شوشتن ! ژ لەوراژی هن خوهـ دابوو ئو هەمی کەس دزانی کونی ژ پالەیێ تێ . هێدی . . هێدی . . گاڤێن خوە ب‌پێش‌دا هاڤێژت‌و ل‌سەر رەخەکێ‌و ل قەراخێ جادێ . . مینا زلامەکی شەڤ‌و ماندی‌و کەرخی ، هەردوو دەستێ خوە دابوو پاش ڤونا خوەو سەر ئەفراز بەر ب‌مالێ ڤە دمەشیا . هاتن و چۆن زێ ل‌سەر جادێ مینا هەرۆ زەحف بوو . . ژ دوورڤە چاڤێ وی ب‌قەوغایەکا مرۆڤا کەت کو ل‌بەر دەرێ دکانەکێ راوەستانە .

نۆلا هەر کەسی . . قەوغایێ سەرنج‌دا هزرو دلێ‌وێ .

ژبەر خوە گۆت : «خودێ خێرکی ئیشەلا . . کا چ قەوکی‌یە ؟» ئەگەر چ قەیێ ژدوورڤە خویادبوو ، لێ‌هاتن و چۆن هەروەکی خوە بوو ، وەکی بێژی هنەکا های ژ قەوغایێ تونەیە !

ئیجار خوە ب‌خوە لەزیا . . لەزیا تا زوو بگهێژە قەوغایێ‌و زانی‌بە ، کا چ قەومی‌یە ؟

گها بەر دەری دکانێ‌و راوەستا .

داهزرێ خوەو ددلێ خوەدا گۆت :

«گەلۆ . . کا چ ل‌ڤێ دکانێ‌دا هەیە ، کو ووسالێ کۆم بوونە ؟»

– گاڤەك ما نەزانی .

– لێ‌دا ژیەکی ب پرسم .

دەڤێ خوە بر بەر گوهێ یەکی‌و ژێرا وەها گۆت :

کەکو . . زەحمەت نەبە ، تو نابێژی من ، چ قەومی‌یەو ئەڤ ژنۆنا چ ل‌ڤر کۆم بوونە ؟

– وەلەهـ دبێژنە . . سێڤ هاتنە ئو ئەم تەڤ ل ژڤانا ستاندنا سێڤا دمینن .

– سێڤ . . هممم . . نێ . . . نێ . . نێ . . .

(ئاخ سێڤ . . دە بلا بەری سی‌چار رۆژا هەبیای ، دەما ئەز نەساخ ، چەند دلێ من سێڤ (خوازتن . لێ تونەبوو) دوان هزرو رامانا دابوو ، دەمێ خوەدی‌یێ دکانێ . دەرێ دکانێ ڤەکر ، ئەو خەلکێ ل‌دور تەڤ ب گەر یەك ل پەی یەك راوەستان ، ژنۆنا کو سێڤا بستینن . چاڤێ وی ب‌شێڤا کەتن ، کە سەرەك کوور ژ نیڤا دلێ خوە بەردار .

(ئێ‌ی . . هێ‌ی . . دنیا) ئو پێرا ژی کەتە گۆمان و هزرو بیرا .

(گەلۆ . . ئو دبێژی قەی ئەڤ سێڤ گوندێ مەنە ؟ !) دەمەك راوەستاو رند ل سێڤا نهێرت‌و رەنگ‌و نفشێ سێڤێن گوند ئانی بەر چاڤێ خوە .

(ئەرێ ب خودێ هەما ئەو ب خوە نە ئوتۆ دبێژی قەی هەمی ژ رەزێ من‌و ژوان بنێن کو من ل‌نێڤ دارێن هرمیکا چاندی هاتی‌یە ژێ کرن !) .

لێ دیسا هەر ب‌خوە ل‌خوە دزڤری ودگۆت :

«نەء . . . نەء . . نەئەون ، یێن ل‌ور ژی هەلاو هەر یەکی تێرا خوە دستاندو یا الله . . گەر ددایێ ل‌پەی . ئیجار ئەو ژی ددلێ خوەدا گۆت :

(ئەگەر چ ئەڤ نەسێڤێ گوندی مەنە ، لێیا براستی مرۆڤ ژخودێ‌را بێژی سێڤێ باشن ، نزا ئەز ژێ هنکا بستینم . . نەستینم . . بکرم . . نەکرم . .) .

(ناوەلەهـ ئەز ناستینم . ما ئەزێ چ بستینم . . ها ؟ ئەڤە ژ سوێ وەرە هەیا ها ئها . . ئێڤارە ، ئەزێ سەتلێ شەمەنتوێ تینم‌و دبم ، پشتا من شکەست ، ناڤا من نسل ، دەستێ من رزین . . هەلاوەر بینەو بیە . . وەرمو هەرە . . بینەوبیە . . وەرمو هەرە . سێ دینار داینە من ، ئەو ژی هەر هەند ئابوریا مال پێ یێ ، ژخوە من پێنج دینار ژی ژ جیرانێ خوە وەرگەرتنە هەتا ئەز پێ چۆ بووم جەم نوژدارەکی ، خودێ مالاوی نوژداری ئاڤا بکی‌وکارێ وی تم‌وتم راست بینە ، باش بوو جامێری حەقێ لێ نهێرتی ژمن نەستاند ، یان ئەو پێنج دینار هەما تێرا حەقێ دەرمانێ من ژی نەدکر ، خودێ ژی ژکەرەم‌و رەحما خوە کێم نەکی ، ئەز رۆژەك دچم کاری‌و دوو – سێ رۆژان بێ‌کار دمینم !) .

دەنگەك هات گوهێ وی .

– باڤۆ . . باڤۆ . . (ئەو کەچاوی ئامەزن بوو)

– کەچێ ئەڤ تو ل‌ڤر چ دکی ؟

– باڤۆ ئەز تەڤ دیا با هۆز هاتمە ، وێ دڤێ سێڤا بستینە .

– قەنجە . . وەستاندن ؟

– ئەرێ . . ئەمێ هەرن مال .

– دەهەرە کەچامن . . هەرە . . دڤێ تو زوو هەری مال ، لێ هایا تە ژتە هەبە . . . هایدار بە ژ ئوتومبێلان .

- باشە باڤۆ .

- باڤۆ . . باڤۆ . . ماڤەی تو ژی هنکا ژمەر ناستینی ؟

وەلەهـ نزا چامن ! ما دلێ تە سێڤا د خوازن ؟

- ئەرێ ب خودێ . . نەء . . نەءَ . . . هەما نەستینە ، مە نەڤێن ، لێیا ئەگەر ئەزی بکاری‌باوتە هنەك ژ مەرا ئانی‌با وێ کێفا مە گەلەکپی‌ێ خوەش ببا ، چکو نوزانی باڤۆ ژ سالا پار وەرە مەسێف نەدیتنەو مە تام نەکری‌یە !

- دێ بلا کە چا من بلا . . هەما بەرە «شەش ژی لێ سەر هەفتان» و ئەزێ ژی هنکا بستینم‌و ئەزێ وەرم .

دە هەرە توژی کە چا من هەرە . .

کەچك چۆو هەتا ل سەرێ جادێ ژی پێنج داووندا بوو ، هەر لێ دنهێرت . (ئی‌ێ . . هی‌ێ . . زاروێ مرۆڤ وەلێ شێرینە ، کو مرۆڤ نکارە دلێ‌وان بهێلەو خوازتا دلێ وان بـجی نەکە . خودێ قەوەتا من بدی ئەز توجاری لێ دلیا زاروکێن خوە ناکم) .

- دائەزێ ژی هەرم گەرا خوە بگرم .

کەتە رێزا خەلکێ‌و چاڤ ل گەرا خوە ما .

گەر گهاوی‌و هەر سێ‌دینار ژ بەریکا خوە دەرئانی‌و وناڤ دەستێ خوە دەڤورمجاندو ب هەمرو هێزا خوە گڤاشت .

حودانێ دکانێ پرس‌کرو زێرا وەها گۆت :

-- تە چەند دڤێت برا ؟

- ها . . کێ . . . دد . . . نزا ! نزا . . چەندا بستینم !

- کابینە پەرێ تە چەندن ؟

هەرسێ دینار ژ دەستێ ب دەرخستن‌و ژێ وەرگرتن .

نهێرت . سێ دینارن . دوو کیلۆ سێڤ کرن د کیسکەکێ داو دانێ .

ئەو ژی ما لـور حەیا سێڤ ل دکانێ هەوبوو . هەر ل سێڤا دنهێرت . یەك یەك ژکیسکێ ب دەردخست‌و لێ دنهێرت .

ئیجار ژ خودانێ دکانێ‌را وەها گۆت :

- کابرا . . ئەستێ دینار ژمن برن ئو تە دوو کیلو سێڤ داینە من ؟ کا ژکەرەما خوە مانی‌یا من نادی ئەز هەرم ؟

- مانی یا چ لۆ ؟ نێ من حەقێ کیسکێ ژی ژ تە نەوەرگرتی‌یە ؟

- چاوان . . ما کیلۆ ب چەندێ یە ؟

- کەکۆ . . کیلۆ ب دینارو نیڤایە !

- کورێ چاوا کیلۆ ب دینارو نیڤایە . هەی مالك وێران ؟

- کەکۆ ئەڤ سێڤێ ئانی سورن . . سێڤێ (خلاتینە) کیلۆ ب دینارو نیڤایە !

- کورێ . . هەما بەرە (خەلاتێ) ژی بن ، ما قەی (خەلات) نەوەلاتێ مەیە ؟ پا ب خودێ تو

بەری دوو سالا هاتبای با من ل گوند ، منێ دوو جەوال ژێ سێڤێ‌و هێ چێتر ژی بدانانە ب سێ دیناران .

- برا . . «سلاڤ ل سفرا حازرە» تو ڤالا چ دکی ؟

- کورێ سفرا چ‌و حازرا چ ، «ژنەڤە دوو بەرو بارێ کەرەکی‌یە» .

- ئو هۆووو . . تها تەچ دڤێت ؟

- ب خودێ برا ل من مەگرە من نەڤێن ، ئەز ڤان سێڤا ناخوازم ؟

ژنەك ب رەخ راوەستا بوو ئو وێ ژی سێڤ دخوازتن ، لێ نەمابوو ئو هەو ببوو . ژنکێ گۆ :

- برا ئەگەر تە نەڤێتن ، هەما بینە ب من دە ؟

- دەها بگرە ، لێ‌کا بینە سێ دینارێ من .

سێڤ دانە ژنکێ‌و سێ دینارا خوە ژێ وەرگرتن .

پاشی ب مەلوولی‌و پۆسیدەیی بەر بـمال چۆ

نێزیکی ل مال کر ، هەو . . نێری ، زاروکێن‌و وی ئەڤ لـبەر دەری راوەستانە ، دلێ وی بـوانڤە شەوتێ ، زانی کو ئەو ل هێڤیا باڤێ خوە وسێڤا مانە ، لێ ماوی دێ چ بکرا ؟

دەما کەت هوندر ، ژ ناوی ژێ پرس کرو گۆت :

- پا تە چما سێڤ ژ زاروکان را نەئانی ؟

- سێڤا چ ؟ ! ژ کۆ بینم ؟

- چاوا سێڤا چ ؟ پا دبا با خۆز سێڤ ژ کۆ نانی ؟

- ئوهۆ . . کەچێ نینە ، نینە ، پەرە نینە ، ئەز ژکۆ بینم ، ئانکو دبەئەز دوو کیلو سێڤا ب سێ دیناران ، ب کەوا من یا رۆژەکێ بستینم . ئەی ئەز کورێ (وەبوەدێ مێردینێمە) . . . ها ؟ !

- جامێر . . هەبوون‌و نەبوون ، ئەو تشتەك ب دەست خودێ‌یە

- راستە ، لێ ئەگەر حەسابێ دەرو مال ل هەڤ نەئێن ، ما ئەزێ چ بکم ؟ . .

مەزن ژی دبێژن : «هەبی‌یە ، کورێ کەری‌بە» .

زارۆ هەمی دوشورمیش ببورن ، لەورا کو باڤێ وان سێڤ ژ وان‌را نەئانی بوو . ئیجار ئەو ژی ل روکێن خوە مێزە کرو ب دل بژۆکی گۆتەوان : باڤۆ . . خەما مە خون ، دوشورمیش ژی مەبن ، ئەم ڤەگەریان ژمەرا نابەودڤی ئەم ڤەگەرن گوند . ئودەما ئەم ڤەگەریان گوند ژی . ئەمێ بزڤرن سەر رەزێ خوە ، هنگێ چەند دلێ‌مە سێڤا بخوازن ، ئەمێ بخون . . . !

**پەیڤێن گران** :

١ - حاجێکی کۆچەر : کوچەر ناڤدارن ، خوەدی پەزو سەوالن . حاجێکی کۆچەر ژی ، ئانکو پەزێ وی‌پر هەنە ، ئو ژبەر کو پەزێ وی هەنە ، دەوێ مالا وان ژی پر هەنە . نەخاسمە ل بوهارا .

٢ - نسلی : کوزری ژبر چادە

٣ - وەبوەدێ مێردینی : زلامەکی هەی بوو ، دەولەتێ بوو . خەلکی بازارێ مێردینی بوو . . گۆتن و پرس ل سەر هاتنە چێکرن . (یضرب به المثل بین الامراد . لانه کان ثریا) .





● ئاشوور بلنیپاڵ و خێزانەکەی ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێڕن بەسەر شای عیلامییەکان، کە سەری بەدارەوە هەڵواسراوە..[1]

هونەر

# لەنێوان قۆینجق و کویسنجق دا

سلیمان شاکر عارف



● ریلیفی «دەڵەشێری بریندار» کە لە کۆشکی ئاشوور بلنیپاڵ لە قۆینجق «لە نەینەوادا» دۆزراوەتەوە ـ لە مۆزەخانەی بریتانی هەڵگیراوە.[2]

لە گۆشەی «لە ئاسۆی هونەری جیهانی دا» لە گۆڤاری کاروان ژمارە (٩١)ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠ ، هونەرمەند محمد عارف باسێکی وەرگێڕاوە بەناونیشانی «پاشماوە هونەرییەکانی کۆیسنجق لە لێکۆڵینەوەیەکی جیهانی دا» کە لە مێژووناسی فەرەنسی (لەرنست بابیلۆن)ی وەرگرتووە . .

ئەوەی سرنج راکێشەرە وەرگێر لە زمان بابیلۆنەوە دەڵێ : «ئەم شاکارە هونەرییانە لەژێر گردو هەرێمەکانی کۆیسنجق دۆزراونەتەوەو بەشی زۆریشیان لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن و لووڤەر لە پاریس پارێزگاری کراون . . .» ! !

لە پاشان وەرگێر دەڵێ : «نووسەر پێنج تابلۆشی وەك نموونەی هونەری لەگەڵ باسەکەیدا بلاوکردۆتەوە ئێمەش لە (ئاسۆی هونەری جیهانی) بلاوی دەکەینەوە» . . ئەوەی شیاوی باسە چوار لەم نموونانە پیشان دراوە ، جگە لەریلیف – پڵنگی بریندار – کە خۆی (دەڵەشێری بریندارە) لەرووی هونەرییەوە باسی هیچ تابلۆیێکیان ناکات ، وەئەم نموونەیەش خۆی بەشێکە لەریلیفی «ئاشوور بانیپال راوی شێر دەکات» کە لە کۆشکی باکوور لەنەنیەوادا دۆزراوەتەوە[1] .

نموونەی دووەم کە وەرگێر تەنیا ئەوەندە باسی دەکات و دەڵێ : «ئاشوور بانیپال – کویسنجق – مۆزەخانەی بەریتانیا» . . ئەمەشیان ریلیفێکە بە ناوونیشانی «ئاهەنگ لەناو باخچەدا» کە شاو شاژن ئاهەنگی سەرکەوتن بەسەر عیلامییەکاندا دەگێڕن . . لە کۆشکی ئاشوور بانیپال دا دۆزراوەتەوە کە کۆشکی باکوورە لەنەنیەوا[2] .

کەواتە ئەم شاکارە هونەرییانە لە گردی قوینجق دۆزراونەتەوە کە ئەکەوێتە ناو شوورەی شاری نەینەوا . . نەك لە ژێر گردو هەرێمەکانی کویسنجق . . وەکوو وەرگێر بۆی چووە .

د . طارق مظلوم و علي محمد مهدي لە پەرتووکی (نینوی) دەربارەی کۆشکی ئاشوور بانیپال و کتێبخانەکەی نووسیویانە ! «پاش پشکنینە شوێنەوارییەکان دوو کۆشکی گرنگیان لە گردی قوینجق لە نەینەوادا دۆزییەوە ، یەکەمیان کۆشکی سەنحاریب بوو کە دەکەوێتە باشووری رۆژ ئاوای گردی قوینجق و دووەمیان کۆشکی ئاشوور بانیپال بوو کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ئەم گردە . . .» .

لە لاپەرە (١٧)ی هەمان پەرتووکدا دەربارەی گردی قوینجق دەڵێن : ئەم گردە دەکەوێتە باکووری رووباری خۆسر ، هەروەها دەڵێن شێوەیەکی هێلکەیی بەخۆیەوە دەبینێ کە درێژییەکەی نزیکەی کیلۆمەترێکەو پانایی یەکەی نیو کیلۆمەترەو بەرزایشی نزیکەی (٣١) مەترە لە رووی دەرباوە . . هەروەها ئەوەش دەڵێن کە : قوینجق ووشەیەکی تورکییەو گۆرانکاری هاتوتەسەر . . لەم رووەوە رایەکی تریش هەیە کە ئەم ناوە واتەی (لەوەرگای مەر) دەبەخشێ چونکە ئەم ناوچەیە لەزۆربەی وەرزەکانی ساڵدا دەبێتە لەوەرگایەکی زۆر ، هەروەها دەربارەی ئەم مەڵبەندە ئاشوورییە وتوویانە گردی قوینجق زور کۆشکی شاهانەو پەرستگاو دەزگای بەرێوەبردنی تێدابووە . . بۆیە بە مەڵبەندێکی سەرەکی لەنەینەوای پایتەختی ئاشوورییەکان دادەندرێ .



● گواستنەوەی پەیکەری گای باڵدار «لاماسو» بە کەلەك لەناوچە شاخاوییەکانەوە بۆ کۆشکی میری.[2]

زیاتر لەو زانیاری‌یانەی کە خستمنە بەردەم ، لەباسی کۆشکەکانی نەینەوادا شریف یوسف لە پەرتووکی «مێژووی هونەری بیناسازی عیراق لەچەرخە جۆربەجۆرەکاندا (تاریخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور) لاپەرە (٤٧) دەڵێ :

ئەو کۆشکانەی کە سەنحاریب‌و ئەسەرحەدوون‌و ئاشوور پانیپال بنیاتیان نابوو دەکەونە ژێر دوو گردی سەرەکی کە رووباری خۆسر بە نێوانیاندا دەروات یەکەم هەلکەندنەکانی شوێنەواری کە لەم دوو گردانەدا بۆ تاقی‌کردنەوە کرا لە گردی باکووری رۆژ ئاوا بوو کە (گردی قوینجق)ە ساڵی ١٨٤٢ لە لایەن جێگری قونسلی فەرەنساوە لە موسل دەستی‌پێ‌کرا دوایی (لابارد) و (رەسام) و (لوفتس) و (سمث) لەسەر ئەم هەڵکەندنانە بەردەوام بوون . پاشان (کینك) کۆشکەکانی سەنحاریب‌و ئاشوور پانیپالی لەم گردە دۆزی‌یەوە .

لە شوێنێکی تردا وەرگێر دەڵێ : لەم رووەوە نووسەر (واتە ئەرنست بابیلۆن (س . ش) رێزێکی تایبەتی لەو بەرهەمانە دەنێ‌و دەڵێ «رواقی کویسنجق لە مووزەخانەی لەندەن زۆر لە هۆڵی ئاشووری جوانترە کە لە مووزەخانەی لووڤری پاریسە» .

ئەوەی زاندراوە کە رواقی قوینجق (نەینەوا) لە مووزەخانەی لەندەن هەیە بەلام هیچ رواقێك بە ناوی کویسنجق لەوێ نەبیستراوە .

هەروەها نەشبیستراوە کە لەژێر گردو هەرێمەکانی دەوروبەری کویسنجق هیچ هەڵکەندن‌و دۆزینەوەی شوێنەواری کرابێت .

بۆ زیاتر روونکردنەوە بە پێویستم‌زانی چەند ریلیف‌و نەخشەی شاری نەینەوا بخەمە بەرچاو کە شوێنی گردی (قوینجق)ی تێدا دیارکراوە بە شێوەیێکی ئاشکراو روون ، بۆئەوەی خوێنەری ئازیز ئەگەر بۆی بکرێ بگەرێتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی زانیاری‌یەکانم لێ‌هەڵێنجاون .

لە دوایی‌دا دەڵێم هونەرمەند محمد عارف خزمەتی هونەر و هونەرمەندانی کوردی کردووە بەوەرگێرانی زۆر باس‌و پەرتووکی هونەری لە زمانی بێگانەوە بۆ ١
زمانی کوردی هیواداریـن هەردەم سەرکەوتوو بێت‌و بەخشینەکانی بەردەوام بێت .

(١) وولاتی ئاشوور لاپەرە (٧٥) دانانی لەندرێ بارو وەرگێرانی د . عیسی سلمان و سلیم طه التكريتي .

(٢) هەمان سەرچاوە لاپەرە ٦٠ . ٦٢ . ٦٧ . ٧٠ .




● نەخشەی شاری نەینەواو شوورەکەی کە شوێنی گردی «قونیجق»ی تیدا دیار کراوە.[1]

یعقوب القصاب

# لە پێناوی چاوتێری دا

ماڵ بنچینەی ژیانەو خوێنبەربەتی بەڵام دەبێ ئێمە لە بۆ ماڵ نەژین ، چونکە ناژین تاکو بخۆین ، بەڵکو دەخۆین تاکو بژین . ماڵ باشترین شارستانێتی دروست دەکات ئەگەر بۆ پرۆژەی مرۆڤایەتی بەکارهات ، بەڵام ئەگەر بۆ شەڕو پرۆژەی نامرۆڤایەتی بەکار هات ئەوە دەبێتە چەکێکی کوشندە لە دژی مرۆڤایەتی‌و هەموو خراپەیەك دروست دەکات .

مەردومی واهەیە ڕق لە ماڵ دەبێتەوەو کار ناکات‌و هەروەکو خۆرەی بێ کەڵك دەژیت‌و بەدرێژایی ژیانی ئاسوودە نابێت ، چونکە تەمبەڵ‌و تەوەزەڵە ، حەزرەتی سلیمان بە تەمبەڵ دەڵێت : «برۆ سەیری مێرووله بکە چۆن دەرەنجێت‌و خواردنی زستان دادەنێت ؟» . کەچی «ڤۆلتێر» دەڵێت : «تەمبەڵ سامانی ئەو گەلە دەدزێت کە لەگەڵی دا دەژیت» .

کەواتە مەردومی تەمبەڵ لەناو کۆمەڵدا شوێنی نی‌یە چونکە مشەخۆرێکی زیان بەخشەو دەبێت قەڵاچوو بکرێت ، ئەو کەسەی بە ئارەقی ناوچاوانی نان پەیدا نەکات پێویستی بە بەزەیی سۆز نی‌یە ، چونکە بۆ خۆی سۆز بەخۆی نابەخشێت تاکو بەژیانێکی ڕەوان‌و مەردانە بژیت . «هولاندە» دەڵێت : «خوا نانی هەموو باڵدارێك دەدات ، بەڵام بۆی ناخاتە ناو هێلانەکەیەوە» .

مەردومی واش هەیە خۆی دەکاتە بەندو کۆتەی ماڵو لەپێش هەموو شتێکی دادەنێت ، ئەم مەردومە هەردەم لەناو کێشەدایە لەگەڵ خۆی‌و دەروونی‌داو ناسرەو بێ‌باوەڕو وورووژاوو گرژ دەبێت‌و دەترسێت ، ئەم بارە دەروونی‌یانەش کاردەکەنە سەر ڕەوشتی هەربۆیە بە دەمارو حەسوودو تووڕەو پەست‌و بەقینەو درۆو دزی‌و تەڵەکەبازی‌و فریودان لەرەفتاری دەبێت‌و لەلایەکی ترەوە ئەم بارە دەروونی‌یانە کار دەکەنە سەر هەموو ئەندامەکانی لەشی هەروەکو دووچاری بەرزی ئەوژمی خوێن‌و نەخۆشی‌یەکانی هەرس‌و دڵ‌و شەکر بێت ، بەپێی لێکۆڵینەوەی «د . ف . دونبار» دەربارەی ١٣٠٠ کەس دیارکەوتووە کە ٨٠٪ی نەخۆشی‌یەکانی دڵ‌و شەکرەو شکاندنی ئێسکەکان بۆ بارە دەروونی‌یەکانی دەگەڕێنەوە . هەروەها تەماعکار هەردەم لەناو کێشەدایە لەگەڵ خەڵك‌دا ، هەموو کارێکی خراپ دەکات ، دوور نی‌یە بێتە دڕك‌و بەسەر لاشەی خەڵك‌دا بڕوات‌و بێتە کۆسپ‌و نانی خەڵك ببڕێت‌و بێتە ماری ژاراوی بەخەڵك بدات بۆ ئەوەی بگاتە مەبەستە چڵکنەکانی چونکە بێ ویژدانەو خوا ناناسێت‌و دیلی پارەیە و هیچ ڕەوشتێکی باشی لێ‌ناوەشێتەوە ، هەموو گەنجینەی گێتی دەست بکەوێت تێر نابێت ، هەر بۆیە «ژان ژاك ڕۆسۆ» دەڵێت : «بەپارە دەتوانین هەموو شتێکمان دەست بکەوێت تەنها ڕەوشت‌و جەماوەر نەبێت .» کەچی «هنری تۆرۆ» دەڵێت : «ئەگەر ماڵ‌و سامان زیاد بوون ، چاکە کەم دەبێتەوە» . ئەوانەی سەودای کۆکردنەوەی ماڵ‌و سامانن لە زۆربەی بارو دۆخ‌دا زوردارو دزو حەرام خۆرن‌و لە دەروونیشیاندا هەژاری‌و کەساسی‌و کلۆڵی زۆر دەبنەوە ، واتەیەکی ئەغریقی دەڵیت : «کە ماڵی حەرام‌و ماڵی حەلاڵ لە بازاردا کۆبوونەوە ماڵی حەلاڵ لەناو دەچێت» . مەردومی تەماعکار بە درێژایی ژیانی خۆشی‌و ڕەحەتی‌و ئاسوودەیی نابینێت «جۆن ڕۆکفلر» لە هەرەتی گەنجایەتی‌دا مەردومێکی باڵا پتەوو بە هێزبوو بەڵام پارەی دەپەرست ، ئەگەر کەمی قازانج بکردایە دەکەوتە ناو مێردزمەو ئاهین‌و غەم‌و پەژارە دای‌دەگرت ، ئەگەر زیانی‌بکردایە دەکەوتە ناو دۆزەخ ، ئەم بارە دەروونی‌یەی ناسرەوی کردو وای لێ‌کرد بە دوای پارە غار بدات ، هێشتا لە تەمەنی ٣٣ ساڵی‌دا بوو بووە ملیۆنێر ، بەڵام کە تەمەنی بووە ٥٣ ساڵ بووە ئێسکێکی بێ گۆشت‌و چەرمێکی ڕەق‌و تووشی نەخۆشی گەدە بوو ، هەتاکو بەقەد منداڵێکی بچووك نەی دەتوانی بخوات ، تەنیا بسکویت‌و ماستی پێ دەخورا کە نرخی هەموو خواردەمەنی لەمیانی هەفتەیەك‌دا دوو دۆلار بوو کەچی لەم ماوەیەدا دەست کەوتی یەك ملیۆن دۆلار بوو ، ئەم کلۆڵە بە درێژایی ئەم تەمەنەی ڕۆژێك پێ نەکەنی‌و خوشی نەچێژا . لە کرێکارەکانی کۆمپانیای پنسلڤانیا دەترساو ئەوانیش لێی دەترسان‌و ڕقیان لێ دەبووەوەو ئومێدی سێدارەیان بۆ دەخوازت ، کە بەجارێك گیان‌و تەندروستی ڕمان نوژدار پێی‌وت : «یا ئەوەتا لە کارت وازبێنە یان بمرە» . ئەویش وازی لەکار هێناو دەستی کرد بە دابەش کردنی ماڵ‌و سامانی بۆ پرۆژەی مرۆڤایەتی ، زانکۆی «شیکاغو»ی نوێ کردەوە ، زانکۆی «تسکیجی» بۆ زنجیەکانی دروست کرد ، یاریدەی «د . چارلز ستایلر»ی‌دا بۆ سەرکەوتنی تاقی کردنەوەکانی ، دەزگای «ڕۆکفلر»ی دروست کرد بۆ قەڵاچوو کردنی نەفامی‌و نەخۆشی لە گێتی‌دا ، هەر سامانەکەی ئەوبوو یاریدەی دۆزینەوەی پنسلینی دا کە هەزاران کەس لەنەخۆشی ڕزگاریان بوو ، کە ناوبراو ئەمانەی کرد ئەوساکە هەستی کرد بە هێمنی‌و ئاسایش‌و دڵنیایی‌و بەختیاری‌و زور بەباشی دەخواردو دەنووست‌و پشووی دەدا ، ناوبراو دەی‌وت : «گرنگ نی‌یە تۆ دەوڵەمەندی ، گرنگ لەوەدایە کە سوود بەخش‌و خۆشەویست بیت» . خۆزگە دەوڵەمەندەکانی ئێمەش ماڵ‌و سامانیان بۆ پرۆژەی مرۆڤایەتی‌یان تەرخان دەکرد ، نەك بۆ بەرژەوەندی خۆیان .

«كابلك»ی ئەمریكی لە دەوڵەمەندە ناودارەكانی ئەمریكابووو هەموو كاتێك هەرباسی پارەو كاروباری كاری دەكرد ، كە بۆ گەشتێك بچووبایە بەنووسەرەكەی دەوت : «دەی هەڵسە نامە بۆ مامیلەكانم بنێرە» . كە سواری ئۆتۆمبیل ببووایە لەگەڵ كاربەدەستەكانی دەربارەی هەڵسوورانی كۆمپانیایەكەی دەدوا ، لە میانی كاتەكانی حەسانەوەو خواردنی‌دا هەربیری لەسەر پارە كۆكردنەوە بوو ، ئەم مەردومە گەیشتە ئامانجی . بەڵام رۆژێكی بە خۆشی نەبردە سەرو نەی دەزانی كە پارە نوینی حەسانەوەی باش ئامادە دەكات بەڵام نووستن‌و خەوی خۆش ناكرێت ، نەی دەزانی پارە داودەرمان دەكرێت بەڵام مەرج نی‌یە تەندروستی ساغ بكرێت ، نەی دەزانی كە مەردوم خۆی ون كرد هەموو مالی گێتی نای دۆزێتەوە ، نەی دەزانی كە كفن گیرفانی نی‌یەو بەبێ پارە دەكەوێتە بەر بارەگای خوای مەزن‌و بەپێی گوناهەكانی سزای دەدات . ماڵ پێویستە بەڵام ڕەوشتی باش لە ماڵ زیاتر پێویستە ، ماڵ‌و ڕەوشتی باش هێمنی‌و دڵنیایی بە كۆمەڵ دەبەخشن ، چونكە ئەو ماڵە لە پێناوی دروست كردنی پرۆژەی مرۆڤایەتی‌دا مەزاخت دەكرێت‌و خەڵكیش سوودی لێ‌وەر دەگرێت . بەڵام ئەو كەسەی تەنیا ماڵ بخوازێت ئەوە دەبێتە دڕندەی كۆمەڵ‌و بە ڕەوایی‌و نا ڕەوایی پەیدای دەكات . ئاسوودەیی لەوەدایە كە مەردوم بەخشینی زۆر بێت نەك سەندنی ، بەڵام ئەگەر هەموو خەڵك ببنە گورگی یەكتر و زگی یەكتر هەڵبدڕن ئەوساكە كلۆڵی‌و شكستی بەسەر كۆمەڵ‌دا دەسەپێن‌و بەرەو نەمان دەچێت .

مەردومی چاوتێر دەزانێت ژیان پێویستی بەماڵە بۆ ئەوەی خۆی‌و منداڵەكانی بەخێو پەروەردەو ڕۆشنبیر بكات‌و ڕازی یە بەوەی هەیەتی‌و چاوتێرەو سوپاسی خوای مەزن دەكات‌و لەهەمان كاتیش‌دا دەرەنجێت‌و بە ئارەق ناوچاوانی سەركەوتن دەخوازێت ، هەربۆیە ئاسوودەو هێمنەو حەسوودی بەكەس نابات‌و خۆی لەگەڵ كەس‌دا بەراوورد ناكات‌و دەڵێت : «خۆهێزو تەندروستی‌و چاوتێری‌و باوەڕی‌و خۆشەویستی‌و بەزەیی‌و دەست‌پاكی‌و توانام هەیە ، ئەمانەش لە دەوڵەمەندی باشترن» . مەردومی چاوتێر گیانێكی بەهێزی هەیە كە كۆڵدان‌و سڵ توونەوەو ناسرەوی نازانێت . گیانێكی باڵای هەیە كە لە عاستی تەماعی‌و مالی گێتی‌و قینەو ترس‌و ناخۆشی ناهەژێت . گیانێكی خنجیلانەی هەیە كەمافی خەڵك دەدات‌و ئەركی خۆی جێ‌بەجێ دەكات‌و داوای مافی خۆی دەكات . «هولمز»ی پارێزەری دادگای باڵای ئەمریكی ۹٤ ساڵ ژیاوەو دەڵێت : «ژیان وێنەیەكە ئێمە دەی‌كێشین ، نەك ڕەنووسەوكۆی دەكەینەوە بەختیاریی مەردوم لەوەدایە چاكەو پیاوەتی‌و [illegible] كۆمەڵ بكات‌و بەرهەمی زیاتر لە خەرج كردنی بێت‌و ڕووخسارێكی گەشبینی هەبیت لە تەك لەشێكی ساغ‌و دەروونێكی ساف‌و هۆشێكی ڕۆشنبیر بێت تاكو بڵێت : «چەند جوانە ژیانم نەك چەند ماڵ‌و سامانم كۆكردۆتەوە» . جارێكیان پاشایەك ویستی بۆ وەزیرەكەی بسەلمێنێت : كە دەوڵەمەندی بە دڵە نەك بەسامان‌و پایەی بەرزی . ڕۆژێكیان خۆی گۆڕی و بووە میوانی وەزیرەكەی ، وەزیرەكەشی بە ژنەكەی دەڵێت : «تەنیا نان‌و ئاوی بۆ/ بێنە برسی‌یە بابخوات» . پاشان خۆی‌و وەزیرەكەی خۆیان گۆڕی‌و بوونە میوانی گەنجێك‌و دایكێك كە تەنیا سێ بزنیان هەبوو . پاشا بەكوڕەكە دەڵێت : «ئیمرۆ میوانی تۆین» . كوڕەكەش لە ڕۆژی یەكەم بزنی یەكەمی كوشتەوە كە مانەوە لە ڕۆژی دووەم بزنی دووەمی كوشتەوە لە ڕۆژی سێ‌یەم بزنی سێ‌یەمی كوشتەوە كە بۆ ڕۆژی چوارەم مانەوە ، هەڵسا چووە بازار بۆ ئەوەی پێستی بزنەكان بفرۆشێت و بە پارەیان ن بۆ میوانەكان بكرێت ، بەڵام لە بازاردا بە پلانی پاشا گرتیان‌و خستیانە بەندیخانە ، ئەوساكە پاشاو وەزیرەكەی گەڕانەوە بۆ كۆشكی پاشایەتی‌و پاشا پرسیاری كوڕەكەی كردو هێنایان بۆی‌و هەموو پیاوەكانی كۆشكی بانگ كردو پێی وتن : «خۆم گۆڕی بوومە میوانی وەزیرەكەتان ئەویش تەنیا نانی وشك‌و ئاوی دامێ ، هەردووكیان بووینە میوانی ئەم گەنجە بە هەموو توانای ڕێزی لی‌گرتین . لەبەر ئەمە بڕیارم‌دا وەزیرەكەتان هەڵواسم و ئەم گەنجە نازدارە بكەمە وەزیرتان» . ئەنجا كچەكەشی لێ مارەكردو حەوت ڕۆژ شیلانیان گێڕا .

مەردومی چاوتێر هەموو ڕەوشتە بەرزەكانی ژیان هەروەكو چاكەو پیاوەتی‌و كەڵەمێردی‌و ئازایەتی‌و خۆبەخت كردن لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی‌دا هاوشانیەو هێمنەو بە هێمنی‌كاری خۆی دەكات‌و لەگەڵ خەڵك‌دا دەگونجێت‌و جێی ڕزامەندی خۆی‌و خەڵكەو ڕێز لە خۆی دەنێت‌و خەڵكیش ڕێزی لێ دەنێن‌و دڵ‌و دەروون‌و لەشی ساغن‌و بە ڕووخۆشی‌یەوە ژیان دەباتە سەرو دەبێتە گوڵێك هەر شوێنێك بێت بۆنی خۆش دەبەخشێت ، هەروەكو داری بە بەرە بەرەكەی لەكاتی خۆی‌دا پێ دەگات . «برتراندرسل» دەڵێت : «چاوتێر هۆشی ڕۆشنبیرەو ئارەزوومەندی بەهێزەو كارزان‌و بەرهەم هێنەرەو بەزەیی‌و سۆزی نایاب لە وێژدانی‌دا گەشەدارن» . «غاندی» نموونەی نایابی چاوتێری بوو . غەمی خۆی نەدەخوارد بەڵام غەمی هەموو برسی‌یەكی خستبووە سەر شانی . ناوبراو تەنیا بزنێكی هەبوو شیری دەخواردو هەموو ئامانجەكانیشی خۆی لە پێناوی گەلەكەی‌دا بەخت بكات‌و سەربكەوێت .

چاوتێری ڕەوشتێكی بەرزەو هێمنی‌و دڵنیایی بەمرۆڤەوە دەبەخشێت‌و غەم‌و پەژارەی گێتی لادەبات‌و گیروگرفتەكانی دارایی جیهان شیتەڵ دەكات ، چونكە سامانەكەی بەشی هەموو گەلەكان دەكات ئەگەر بەچاوتێری بژن‌و لە ژێرو پایەو سایەو هێزو دەسەڵات چاكترە ، هەر بۆیە وتراوە : «چاوتێری گەنجینەیەو لەناو ناچێت» .

---

سەرچاوەكان :
١ - السيكولوجية المبسطة / الطمأنينة ط ١ دار الافاق الجديدة بيروت ١٩٧٨ .
٢ - ديل كارنيجي ترجمة عبد المنعم الزيادى ط ١٥ - دع القلق وابدأ الحياة / مطبعة الخانجي / مصر
٣ - سلامه موسى / عقلي وعقلك ط ٣ منشورات الخانجي ١٩٦٤
٤ - سلامه موسى - محاولات سايكولاجية / منشورات مكتبة الخانجي مصر ١٩٥٣
٥ - سمير شيخاني / علم النفس في حياتنا اليومية ط ٣ دار الافاق الجديدة بيروت ١٩٨٠ .



# خـــــەنجەر

حسیب مامه قاله قازی
«کلکه سماقی»

تیغێکی زۆر خۆراگـرو پتـەوو بەهێـزە، لەدێر زەمانەوە لاوی بەدەست و مەقـامـو چاپوك ئەم تیغەی لە کالان هەڵکێشاوەو بەربەرەکانی نارەوایی‌و زۆرداری پێ کردووە.

وەجگـەری تاوانباری پێ پارە پارە کردووە، واتە خوێن جگەر یاخەنجەر یاخود هنجر [1] تیغێکی هێندە بەکارە ئەگەر دەست و بازووی پتەو بەتوانادای بوەشێنێ بۆی هەیە گۆشت و ئێسقان وەکو یەك ببرێ،بۆ رازاندنەوەی مسکی خەنجەر گوێ ئاڵتون یازیو لە کۆتایی مسکەکەیدا دەچەسپێنن، جاران زۆر گەنجی لێ وەشاوە کەرانك و چۆغەی لەبەر دەکردو جاوی هەوارامانی لە پشت دەبەست و جامانەی شینێ بەچویت یاخود مشکی حەوت زەرعی لەســەر دەکـردو کڵاشی تیرە قایمی هەورامـانی لەپێ دەکـردو ئەو خەنجـەرە دەبـانـەی لەبـەر پشتێنی رادەکـردو نەزبێحێکی ناســك و جوانی بەرزنجـەی لەمسکـەکـەیـەوە دەهـاڵانـد، تەنهـا ئافەرینی دەویست چونکە نەریت و دابی نەتەوایەتی لەسیمایەلەدەرەوشایەوە.

## چۆنیەتی خەنجەر

١ ـ پۆلای خەنجەر جیاوازە لەگەڵ ئەو پۆلا ئاساییانەی کەلە بازاردا هەیەو دەبێ کانی تایبەتی هەبێت.
٢ ـ خەنجەر گەورەو بچووك و ناوەنجی هەیە.
٣ ـ چەند جۆرە رەسەن و رەچەڵەکی هەیەو هەرناوە تایبەتە بە شێوەیەکیان.
٤ ـ خەنجەرەکان بەگشتی گران بەهان بەلام لەنرخدا هەر جۆرە لەوی دی جیاوازە.

٥ ـ مسکـە خەنجەر لەشاخی کەڵە کامێش و حەیوانە کێوی دروست دەکـرێت، بەڵام ئەوەی لە شاخی کەڵە کامێش بێت چاکترە هەروەها لەشفرەی فیلیش دروست دەکرێ.

٦ ـ خەنجەر ئەم جۆرانەی خوارەوەی هەیە کە وەستا کارامەو شارەزاکـانمـان لە ساڵانی زوودا لە کوردستـاندا دروستیان کردووە: دەبـان، خۆراسـان، کرمـان، قەزبێن، شیراز، لاهور، شینەتیغ بەڵام ئەوەی جێگەی داخ بێت ئەوەیە کە هەر ئەو چەند دانـە خەنجـەرەی لەووڵاتی ئێمەدا هەیە هەر ئەوەیە دەستاو دەست دەکـات و ناوچـەبـۆ ناوچـە دەچێت، وەنـەبێ لەم سەردەمـەدا پارچەی تازە دروست بکرێت یا بێتە ناوەوە بگرە لێشی دەفەوتێو لەناو دەچێ. لەلایەکی دیکەوە کە دەڵێن کانی پۆڵاکـەی جیاوازە دەبێ وابێت، چۆن بەرد ناوی بەردە بەڵام بەسەران جۆری هەیە وەکو بەردی مەرمەرو بەردی ئاڵتونیو چەندین جۆری دی بێگومان بەهەمان شێوە پۆڵاکانیش چۆنیەت و جۆریان زۆرە، چاوەکو دەڵێن پۆڵاکەی لەرووی بازرگانیەوە هاتبێو دەستـاو دەست لەنێـوان سەدەکاندا بەوڵاتاندا بڵاو بووبێتـەوە بەتـایبـەتی لە ئێرانـەوە چونکـە هاوسنورین زۆر کەسیش بڕوای وایە کەپۆڵا دەخەنە نێو دەریای قەزوێنەوەو بۆ ماوەی چەنـد مانگێـك بەهـۆی سوێـری ئاوی دەریاو بوونی چەنـدین تەنی تەواوەی ناو دەریاکەو چەوری و گەرمیەوە کار ـەکـاتە سەر ئەو پۆڵا ئاساییەو ڕەنگ و پێزو هێزی پۆڵاکە ـەگـۆڕێو جۆرە پۆڵایەکی لێ دروست دەبێت کە بۆ خەنجەر ـەست بدات، گوایە ئەم کارد بۆ خەنجەری «قەزبێنە» ڕادەی ڕاستی و ناراستی باسە کە تاچ سنورێکە ئەوەیان روون نیە! وەستا قادرکۆیی دەڵێ:

شارەزایم بەجـۆرە پۆڵایەکی دیکە هەیە کە وەستا کەم ـروستی دەکرد خەنجەری جەوهەرداری چاکی لێ پەیدا دەبو. ـساڵی ١٩٢٠ دا لە کۆیە شاگرد بوم وەستایەکم هەبوو هێنای ـتر لە سەد دانـە «مەورەد ـ برنبەند ـ کارتیغ»ی خستە نێو کوورەوەو بۆ ماوەی یەك مانگ هەموو ڕۆژێ من سێ سەعات ئەو کورەیەم دەدەماند. پاشان ئەو مەورەدانەی دەردێناو لەو سەد دانـەیـە چەند دانەیەکی.لێ دەردەچووکە جەوهەری لێ پەیدا دەبـو، وەستـاکـەشم ئەو پارچە چاکانەی دەکردە خەنجەری جەوهەردار بەڵام بەمەزندەی خۆم هەر نەدەگەیشتە جەوهەری پۆڵای ڕووسی. دەسـت گەرمی وەستـاکـەی من و بەگشتی وەستـاکـانی کەی ناوچـەکەو شارەزاییان بۆ دروست کردنی خەنجەرەکان هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ خەنجەرەبیانەکان و بگرە چاکتریش بوو خۆ ئەگەر شیر یا پۆڵای ڕووسیان دەست بکەوتایە باشترین خەنجەری جەوهەرداریان دروست دەکرد. بەڵام زۆرم لا ناخۆش بوو ئەو هەموو وردەکاریەیان دەکرد تا خەنجـەرێکیـان دروست دەکـرد کەچی هەربـەنـاوی دەبان یاقەزبێن ناویان دەبرد بۆیە دەم کردە شەڕ لەگەڵ وەستاکەم، دەم گوت بۆنـاوی نانێی باواجی یا سەفـین دەیگـوت: ڕۆڵە هەروەها هاتووە بائێمە ناوی تازەی بۆدانەنێین لەراستیشدا ئەو وەستـایەی کورد لە هەردوو دیوی ئێران و عیراق هەیبووە لە جیهـاندا وێنەی کەم بووە هەروەها سوارچاك و شارەزایەکی بەتەمەن داچوو کە ناوی شێخ ڕەفیق قاز بەگیانی‌یە دەڵێ:

کە دەڵێن خەنجـەری کرمـان یا خۆراسـان یا دەبـان... هتد مەبەست ئەوەنی‌یە کە خەنجەر لەو جێگایانە دروست کرابێت ئەوەی من بزانم کاتی خۆی بەر لە ٢٠٠ ساڵ و بەرەو خوار لە پۆڵای ڕووسی شیریـان لەونـاوچانە لە ئێراندا دروست دەکرد وەخـۆم نمـوونـەی ئەو شیرانـەم دیـوە هەمـوو جەوهەر یان لەسـەربـووە وەکو پەری پۆرو قازی بازی دەدرەوشایەوە ئەو شیرانەیان دەکرێو دەیان هێنا بۆ ڕواندوزو کەرکوك و هەولێرو کۆیە دەیانشکاندەوەو هەر شیرەسێ خەنجەری.لێ پەیدا دەبرو دووبـارە ناویـان بەسـەر خەنجەرەکەدا دەبری بە ناوی ئەو جێگـایەوە کەشیرەکەی لێوە هاتووە وە لەراستیدا ڕەوانە بوود دەبوایە بەناوی ناوچەکانی خۆمانەوە ناوبنرێ چونکە ئەو جۆرە خەنجەرە تەنها کورد هەیەتی. دیسان دەڵێ:

وەستـای چاك و بەنـاوبانگ لە کوردستاندا زۆر بووە وە ئەم خەنجـەرەی خۆم کە جەوهەردارو قەزبێنە چاکترین وەستای شاری کۆیـە کەنـاوی وەستـا «مچیـل» بووە باپیرەی حاجی

حەمـەشێتی خوالیٚخـۆش بوو کە ئێستـا نەوەی لە کۆیەماوە دروستی کردووە دەستـاودەست پاش پێنج پشت لەبنەماڵەی خۆمان گەیشتۆتە دەست من واتە وەستا مچیل بەرلە ٢٢٠ ساڵ لەمـەوبـەر دروستی کردووە وە بڕوام وایە لە هەموو جیهاندا کەس شارەزایی ئەوی نەبـووە لە بواری خەنجـەرسـازیدا. دەشڵێن لەرووی دروست کردنی شیرەوە چاکتـرین وەستـای رۆژهەڵات لەئەرز ڕوم بووە بۆیە چاکترین شیری هەبووەوە لە لاوك و حەیراندا بەسەر ئەو جۆرە شیرو مەتاڵەیاندا هەڵ داوە کە کاتی خۆی لەوێ دروست کراوە دەڵێ:

## شیرێکی شوغڵ گەلی ئەرزرومی
## لە گەڵ مەتاڵێکی گوێیە فیلی

هەروەهـا کاك شێخ ڕەفیق دەڵێ ئەوەی بەچاو دەبینرێ دەمی خەنجـەر «ئـاڵە» واتـە کولە بەڵام بەهـۆی جەوهـەرداریو جورچاکی پۆڵاکەیەوە دەڵێی ئەڵماسە دەمەکەی ڕاوەشێنە زۆر شت دەپـەڕێنێ بەڵام دەمی پۆڵاو تیغـە ئاساییەکان ئەگەر هەندەی دەمی ئەو خەنجەرە کول بێت نیوهەندە تیژ نیە وە ئەو کارەی پێ ئەنجام نادرێ کە خەنجەری پێی ئەنجام ئەدرێ! ئەمە بۆچونێ بوو کە خستمانە ڕوو.

... ئێمـە ناوی خەنجـەرەکـانمـان هێنـا ئێستـاش کەمێـك لەوبـارەیەوە دەدوێین وەکو پێشتر ووتمان کەباسی جۆچاکیان دەکـەین مەبـەستمـان لەپـۆڵاکـانە خەنجەرەکان بەناویانەوە ناوبراون بەڵام وەك گوتمان وەستاکان وەستای وڵاتی خۆمانن:

١ ـ دەبـان: چەنـد جۆرێکی هەیە، بەڵام دەبانی کاتمە «٢» زۆرچـاکـە واتە ئەو جەوهەرو هێڵانەی بەسەر خەنجەرەکەوە ئەبینـرێ شێـوەی دروست بوونی وەکـو شەپۆلی پێچاوپێچی کرمـەك خۆی ئەنـوێنێ، وابـاوە گوایـە دەبانی چاك ئەگەر لەشیری بهاوی دەی مەیێنی‌یا ئەگەر نووکی خەنجەرەکە لەسەر پەنجەت یالەپی دەستت دابنێی وردە وردە پێیدا دەڕواتە خوارێ.

٢ ـ کرمـان: جەوهـەری زۆر جوانـەو شای جەوهـەری خەنجەرەکانی دیکەیە.
٣ ـ خۆراسان: لەزۆر ڕووەوە لە دەبان نزیکە جۆرێکی چاکە.
٤ ـ قەزبـێن: گوڵ و گێـژی ورد لەسـەر ڕووی خەنجـەرەکە ئەبینرێ، لەرەنگدانەوەی داوەکو کۆڵەکە زێڕینە خۆی دەنوێنێ یابـە شێـوەی قازی بازی [٣] خۆی نیشان دەدات ڕەنگەکەی بەزەردو سپی و ئاڵ و مۆرخـۆی دەنـوێنێ، ئەوجـا هەمـوو ڕەنگـەکان بەناویەکدا دەشکێنەوەو جەوهەرێکی ناسك و ڕێك پەیدا دەبێت.

٥ ـ شیراز: جۆریکی چاك و پەسەندە.
٦ ـ لاهور: ئەمیش تیغێکی ڕەختەو چاکە.
٧ ـ شینە تیغ: ئەمە لە دروست بوون و ڕواڵەتدا خەنجەرە و لەئـاسن و پۆڵای ئاسـایی دروستی دەکـەن، بێ بایـەخـەو جەوهـەری نیـە هەرزەکـارەکان هەرلایان جوانە هەندێك جار بەبەرپشتێنیدا دەکەن تا دەری نەهێنی لەکالان نازانرێ چاکە یا خراپ چونکە مسك و کالانی هەروەکو کوخەنجەرەکانی دیکەیە.

ئەمە کورتەیەك بوو لەرووی جۆرەکانەوە بەڵام لەلایەنی دیکەوە برینی خەنجـەر کاریگـەرە ئەگـەر جێگـای خۆی بگرێ چاك بوونەوەی ئاسان نیە زۆر کەسی بێویژدان هەیە سەرە نووکی خەنجـەرەکە لەسەری مار دەدات بۆ ئەوەی ژەهری مارەکەی پێوە بلکێو زەبری کاریگەر بێت و برین بگاتە تیراوی.
هەر کەس چاوی لەم کارە بێت دیارە خوێن ڕێژە نەکا لەسەر هەق بەنـاهـەقیش خەنجەر دەوەشێنێ، چونکە هەموو کارێك سنوورێکی ویژدانی و لێپرسینەوەی بۆدیاری کراوە!
ڕاستە خەنجەر تیغێکی ڕەخت و پتەوو خۆراگرە بەڵام بەهۆی کالانی چاکەوە دەبێ پارێزگاری بکرێ لەگەرماو سەرماو گەرد و ئارەقـە. کالانیش دوو جۆرنەجۆرێکیـان بە گشتی لە زیوی نەخش کراو دروست دەکـرێ بەڵام ڕووکاری ناوەوەی دوو پارچە دارەو ناوەبەرەکەی قوماشە جۆری دووهەم لە دوو پارچە تەختەی نیمچە کەوانە دروست کراوە بەشێوەی خەنجەرە کە

ەبنەوە باریك و لەسەرەوە پان، ناوەكەی بە قوماشی قەدیفە یا ەستۆر یا سورمە یاخود قوماشێكی وەها كە تیغ لێی گیر نەبێت اوپـۆشی دەكـەن. پاشـان ئەو دوو پارچـە دارەلێـك نزیـك .مخەنەوەو دەیانخەنە سەر یەك و بە چەرمێكی تەنك توند چەرم ێچی دەكەن و شەتەكی دەدەن، بەشێوەیەك چەسپی دەكەن ەنـانـەت هەواش هاتـو چۆ ناكات. ئەو جالای سەرەوەی بە ارچەیەك زیو یا پارچەیەك تەنەكە بازن بەند دەكەن، تا سەری .ارەكان لە كاتی سەرماو گەرمادا لێك والانەبنەوەو چەرمە كە ەكشێو كالانەكە تێك نەچێ وەلای دووهەمی كالانەكەش واتە لای باریكایی قونەكەی دووبارە بەتەنەكە یازیو یاشاخ گۆیەكی خری بۆ دەكـەن لەبەر هەمان مەبەست ئەوەی قونەكەی زۆر مەبەست نیە بكرێ یا نە كرێ جگە لە وانەش كەباسمان كردن بەلای كەمەوە ساڵی جارێك یا دوو جار دەبێ مشتومالْ بكرێ، واتـە پا كردنـەوەی لەو گەردو تۆزو ژەنگە نەبینراوەی رووی خەنجەرە كە ئەم مشتومالْەش ماندوو بوون و وەردە كاری‌یەكی زۆری دەوێت و شێـوە دەست بزاوتنێكی تایبەتە بەم جۆرەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت.

## ئەنجام دان و رێكخستنی كەرەسەی مشتومالْ

بەردە چەرخ دێنن لەهـاوانـدا دەیكوتن و چاك دەیهارنەوە تا دەبێتە وردە ئارد پاشان ئەو وردەهاراوەیە لەگەلْ رۆنی كوردی تێكەلْ دەكەن و دەیكەنە سەر رووی خەنجەرەكە، ئنجا لەلقە دار هەنجیرێك بە هەردوو دەست بەتوندی بەردەوام ئەو گیراوەیە مالْ دەكەن بەسەر هەردوو رووی خەنجەرەكەدا. هەر جارەی روویـەكی هەتاكو تەواو پاك دەبێتەوەو ژەنگ و گەردو پیسی و چڵكی رووەكەی بەردەدات و هەڵدەوەرێ، دوای ئەو كارە پارچە ئاسنێكی دی ئاودراو كەبە «مەسقەر» ناو دەبرێ بەتوندی چەند جارێـك بەسـەر رووی خەنجەرەكەیدا دێنن تا كو تەواو پاك دەبێتەوەو هەرچی تۆزو گەردی لەسەر بێت هەڵی دەدات، پاش ئەنجام دانی ئەو وردە كاریانە بۆ جاری سێهەم زاخی ئەردەن.. زاخ چیـە؟ ئایـا مەبـەست ئەو زاخەیە كە رۆژانە بەرچاومان دەكەوێت یا جۆرە زاخێكی دیكەی تایبەتە بەو مشتو مالە؟

ـ زاخی ئەم كارە جیاوازە لە زاخاكانی دیكەو كانی تایبەتی هەیە لە ناوچـەی سەردەشت بەگەڵەزاخ ناو دەبـرێ چۆن گڵنجانی تایبـەتی هەیـە بۆ گڵی دۆشـاو یا گڵەسـەرو... هتـد زاخی خەنجەریش گڵنجانی تایبەتی هەیەو رەنگەكەی زەردباوە.. دێنن گڵەكـە دەكـەنـە ناو دەفـرێكەوەو دەی كوڵێنن پاش ماوەیەك رەنگـەكـەی بەشێوەی چازەرد هەڵدە گەرێ. وەك گوتمان پاك كردنەوەی خەنجەر بە دوو قۆناغدا دەروات واتە پاش مشتومالْ و پاكردنەوەی رووی خەنجەرەكە لەقۆناغی یەكەم و دووهەم دا، بۆ جاری سێهەم بەو زاخە هەردوو رووی چەور دەكەن بەهۆی ئەوەوە رەنگی بنەرەتی خۆی هەڵدێنێ تەوەو بەروونی گۆڵ و گێژو جەوهەری خەنجەرەكە دەبینی وەك ئاوێنە خۆی دەنوێنێ. ئەمە دەربارەی پاكردنەوەی واتە مشتومالْ، بەلام بۆ چۆنیەتی دروست كردنی دەمی تیغەكە بەم جۆرەیە:

پاش گەرم كردنی پارچـە پۆلاكـەو سوركردنەوەی لە كوورەدا دێنن لەسـەر سندانێك دای دەنێن بەلام ئەو سندانە درزێك «قـەڵشتێكی» تێـدایە بەهۆی چەكوچ كاریەكی زۆر وردو پر سەرنـج ژێـرانەوە دەتوانرێ هەردوو دەمی خەنجەرەكە تەنك بكـەنـەوە ئەو «دوخەی» ناوە راستی خەنجەرەكە دەربێنن كە بریتیە لە هێڵێكی بارست «زەق»، وە چاكترین خەنجەر ئەوەیە دوخەكەی بەرزبێت.

هەموو وەستایەكیش دوخی خەنجەرەكەی بۆ دەرنایەت مەگەر زۆر وردو ژیرو دەست گەرم بێت وەكو گوتمان ئەو دەستگایەی كە دەمی خەنجەرەكەی لەسەر دروست دەكرێت تایبەتە.

**پێرست:**

١ ـ **هنجر**: كورد دەڵێ هنجر هنجری كرد، واتە پارچە پارچەی كرد.

٢ ـ **كاتمە**: ئافرەت بۆ ژێر چەنەلای زەرنگەر دروستی دەكات.

٣ ـ **قازی بازی**: جۆرە قالۆنچەیەكی رەنگ و بریقەدارو سەوزەو بەهاران پەیدا دەبێت جاران منداڵ دەمزوویان لەقاچی دەخست و گوێیان بۆ دەنگە خۆشەكەی و گیزە گیزی شل دەكرد






یاسا

# شێوازی نوێی چارەسەرکردنی تاوانکارەکان

رشدی محمد خضر

خوێنەوارانی خۆشەویست . . .

پێش ئەوەی دەست بەنووسینەکەمان بکەین کە بەم ناونیشانەی سەرەوەیە وام بەچاك زانی کە بەکورتی بزانێ روون بکەمەوە کە مەبەستی سزادان لە سەدەکانی کۆندا چی بووە . . مەبەست ئەوە بووە کە تۆڵە لەو تاوانکارە بکرێتەوە بەرامبەر بەو تاوانەی کردوویەتی تاکو ببێ بە پەند بۆ کەسانی دی . . .

بۆیە پیاوانی دادوەر دەسەڵاتێکی تەواوو بێ سنووریان بەکار هێناوەو مەبەست لە بەندکردنی تاوانکارەکان لەبەندیخانەکاندا شێوازێکی سزایی نەبووە بەڵکو مەبەست هەر ئەوە بووە کە تاوانکارەکان لەکۆمەڵ دوور بخرێنەوە تا ئەو کاتەی کە کاتی موحاکەمەکردنیان دەهات ، جا بڕیار دەدرا سزایان کوشتن بێت بە چەندەها جۆر وەك (سووتاندن ، لەت لەتکردنی لەش ، سەربڕین‌و چەندان سزای‌تر وەکو سزای دارایی) .

هەتا لە «فەرەنسا» و زۆر وڵاتی ئەورووپاش‌دا مەبەستیان هەر ئەوەبووە کە لەسەرەوەدا باسمان کرد ، تا شۆڕشی فەرەنسی کە لە ساڵی ١٧٩١ رووی‌داو لەم شۆڕشە کارەساتێکی زۆر گەورەو گرنگی لەم بارەیەوە نایەوەو بەندیخانەکان بەپێی برگەو بەندەکانی دەقی سزای وەرگرت کە یاسا نەخشەی بۆ کێشاوە ، جا ئەوەی کە ئاشکرایە چەند کۆمەڵ‌و میللەت پێشکەوتوویت کار دەکاتە سەر ئەو شێوازانەی کە چارەسەرکردنی تاوانکارەکان زیاتر دەکرێ . . .

بەندکردنی تاوانکارەکان لە بەندیخانەدا ئەوەیە کە دەرسێك وەربگرێ‌و تاوان نواندن نەبێتە پیشەی سەرەکی لە هەموو ژیانی‌دا ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە دوورخستنەوەیان لەبەرچاوی ئەو کەسانەی کە تاوانکار تاوانی بەرامبەر کردوون‌و رێگا لەکەس‌وکاری بگیرێ تا تۆڵەی لێ بسێننەوەو لە ئەنجامدا ببێتە هۆی نانەوەی ئاژاوەو کارەساتی سەخت لەناو کۆمەڵ‌دا . . جا لەبەر ئەوەی شێوازی نوێی چارەسەرکردنی تاوانکارەکان لەرێگای دادگاکانەوە سوودێکی زۆر گرنگی هەیەو دەبێتە هۆی بەهێز کردنی برگەو بەهێزکردنی بەندەکانی یاساو پاراستنی کۆمەڵ‌و کەم‌کردنەوەی تاوان ، جگە لەوەش هەرکاتێ تاوانکارەکان ماوەی بەندییان تەواوکرد دەگەڕێنەوە ناوکۆمەڵ وەکو مرۆڤێکی بەکەڵك . . نەك ئەو تاوانبارەی کە تاوان بۆتە پیشەی‌و لەگەڵ خوێنی‌یان دا دەجوڵێتەوەو چارەسەرکردنیان هەر ئەوەیە لەکۆمەڵ دوور بخرێتەوە هەتا لەگەڵ بەندکراوەکانی تردا لەبەندیخانەکان‌دا لەگەڵیان‌دا بوون . جا لێرەوە دەست بە روون کردنەوەی ئەو شێوازە تازانە دەکەین کە لەگەڵ بەندکراوەکان‌دا بەکاردەهێنرێن‌و بە جۆرەها تاوان لە بەندیخانە بەندکراون بەپێی ئەو (پەرەسەندنە مێژوویی‌یەی کە لە بەندیخانەکان‌دا سیستەمی پێ‌جێ‌بە جێ کراوە (التطور التاريخي للانظمة في السجون) وسیستەمی بەندیخانە

پەیوەندی‌ی بە پلەی ئەو سزادانەوە هەیە کە تاوانکارەکان پێ‌ی موحاکەمە کراون ئەم سیستەمانەش بریتین لەمانەی خوارەوە :

١ – سیستەمی بەندیخانەی تێکەڵاو (نظام السجن المختلط)
٢ – سیستەمی بەندیخانەی تاکە کەسی (نظام السجن الانفرادي) .
٣ – سیستەمی بەندیخانەی بە هەردوو سیستەم (تخليط في النظامين)
٤ – سیستەمی بەندیخانەی کراوە یان واڵا (نظام السجون المفتوحة)

لەم رووەوە بە پێویستی دەزانم کە لەسەر هەر سیستەمێك بە کورتی شتێك باس بکەم بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێز بزانێ تا چ رادەیەك هەر یەك لەم سیستەمانە دەوری خۆی دەگێڕێ و کار دەکاتە سەر بەندکراوەکانو جیاوازی هەر سیستەمێك لەلایەنی چاکی وخراپی‌یەوە چی‌یە ؟

• سیستەمی بەندیخانەی تێکەڵاو

بەپێ‌ی ئەم سیستەمە ئەم جۆرە بەندیخانانە بریتین لە هۆڵی گەورە گەورەو بەندکراوەکان بە رۆژ هەموویان لە هۆڵێکی گەورەدا کۆ دەکرێنەوە لەم هۆڵەدا رۆژ بەسەر دەبەن و ئەم جۆرە بەندیخانانە دروست کردنیان زۆر ئاسانەو پارەکی ئەوتۆیان تێ ناچێتو کار ناکاتە سەر ئابووری وولاتو خراپی زۆر زۆرترە لەلایەنی چاکی یەوە ، چونکە بەندکراوەکان بەبێ ئەوەی لە بارەی سایکۆلۆژی و کۆمەلایەتیو ئابووری‌یەوە جیا بکرێنەوە جا ئەمە دەبێتە هۆی تێك‌چوونی رەوشتیانو دروست بوونی چەند کۆمەڵێك لەناو بەندکراوەکاندا بۆ ئەوەی بەردەوام ئاسایش تێك بەدنو ئەم سیستەمە لە رەخنەی ئەوانە رزگاری نەبووە کە دەربارەی بەندیخانەو جۆرەکانی شارەزایی‌یان زۆرە ، بەلام بەداخەوە هەتا ئێستا هەندێك لەوولاتە پێشکەوتووەکان ئەم سیستەمە بەکار دەهێنن ، بۆ نموونە . . (فەرەنسا) هۆی مانەوەی ئەم جۆرە بەندیخانانەیە ، چونکە ئالیستاش بینایەکی گەورەو تازە نیە تا جیاوازی لە نێوانی ئەو بەندکراوانەدا بکەنو لە یەکیان دوور بخەنەوە .

سیستەمی بەندیخانەی تاکەکەسی

ئەم سیستەمە پێ‌ی دەڵێن سیستەمی (بنسلفانی) و لە ژووری بچووك بچووك پێك هاتووە بەندەکان بە تەنێ لەم ژوورانەدا دەژینو بەشەوو رۆژ لە یەکتری جیان ئەم جۆرە سیستەمە بەناوی بەندیخانەیەکەوە ناونراوە کە سەرۆك (فرانکلین) لە ساڵی ١٧٩٠ لە شاری (بنسلفانیا) دروستی کردووە .

ئەم بەندیخانەیە چەند سوودێکی هەیە ، بەندی‌یەکان تێکەڵاوی یەکتری نابن ، چاودێری کردنیانو ئاگاداری کردنیان زۆر ئاسانە ، لەگەڵ ئەوەشدا زیانەکانی ئەوەیە کە تەنیایی کار دەکاتە سەر مێشكو بیروهۆشیان جگە لەوەی پارەیەکی زۆری تێ دەچێ‌و کاردەکاتە سەر ئابووری وولاتو ژیانی تەنهایی کارێکی ئەوتۆیان تێ‌دەکات کە بەهیچ جۆرێك ئاگایان لە کۆمەڵو باروودۆخی کۆمەلایەتی لێ‌یەو دوای ئەوەی کە بەندێتێ تەواو دەکەنو دەگەڕێنەوە ناوکۆمەڵ زۆر بەزەحمەت لەگەڵ خەڵکی دەوروبەر دووبارە دەگونجێنەوە ، چونکە ئەو بەندی‌یە لەم بەندیخانە تاکە کەسی‌یە کارێکی زۆر سەختی تێ‌کراوە کە ئەویش مانەوەی تەنهایی‌یە ، بە تایبەتی ئەگەر ئەم بەندی‌یە ماوەی حوکم دانەکەی زۆربێ . . لێ‌شك ئەم جۆرە بەندیخانانەش بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێن . . ئەم وولاتانەی کە ئەم جۆرە بەندیخانانەی لێ‌یە (بەلجیکا و ئیتالیا)یە . بەلام ئێستا خەریکن وورده ، وورده ئەم جۆرە سیستەمە لادەبەن .

• سیستەمە لوێرن

ئەم سیستەمە بریتی‌یە لەئەو دوو سیستەمەی کە باسمان کردو ئەم بەندیخانانە یەکەم جار لە ساڵی ١٨١٦ لە (وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا) هاتەکایەوە ، بەندکراوەکان لەم بەندیخانەیەدا بەشەو لەیەکتری جیا دەکرێنەوە بە رۆژ تێکەڵی یەکتری‌یان دەکەنەوە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خراپەی ئەم تێکەڵاوی‌یە کەمتربێ ، تاکو ئێستا ئەم سیستەمە لە فەرەنسادا بەکار دەهێنرێت . لەدوا دوایی سەدەی نۆزدەهەم دەست بەم جۆرە سیستەمە کراوە .

• سیستەمە بەندیخانەی کراوە یان واڵا

ئەوەی لە باس کردنی سیستەمەکانی سەرەوە بۆمان روون بووەوەو لەم بەندیخانانەی کە زانیاری‌یەکان لێ‌زانیو بەندکراوەکان لە جێگایەکی داخراوی بڕ لە دیواری بەرز بەرزدا دەژینو زۆر لە کۆمەڵەوە دوورنو دەقێکی ئەوتۆیان گرتووە کە هیچ بەلایانەوە گرنگ نی‌یە تێکەڵاوی کۆمەڵ ببنەوە . ئەم جۆرە سیستەمەش لەدوا دوای سەدەی نۆزدەهەمەوە هاتەکایەوەو بەندکراوەکان بەپێ‌ی ئەم سیستەمەوە لە بەندیخانەیەکی بێ دیوارو شیشی گەورەگەورەدا دەژینو بە هەموو جۆرێك سەربەستی‌یان هەیە ئەویش تا رادەیەك . بەلام بە شێوەیەکی زیاتر چاودێری‌یان دەکاو ئاگاداری هەڵسو کەوتیانە لە هەموو بارەیەکەوە زۆر کەم ترسی راکردنی‌یان لێ دەکرێت .

ئەم جۆرە سیستەمە بە زۆری لەوولاتانی ئەورووپاو وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بلاوبۆتەوەو بەندی‌یەکانی ئەم بەندیخانانە هەست بەوە دەکەن کە لە کۆمەڵەوە دوورنین ، جگە لەوەی کە زۆریان لاخۆشە لە هەڵسانو دانیشتن‌دا سەربەستیان هەیە ، لەبەرئەوەی مەترسی لە هەندێکیان دەکرێ کە بیر لە راکردن بکەنەوە ، لە هەمان جێگادا هەندێك ژووری تایبەتی دەکرێت بۆ ئەو جۆرە بەندی‌یانەو وای بەچاك دەزانم کە لەوە بکۆڵینەوە دەبێت ئەم بەندکراوانە پەیوەندی‌یان بەکۆمەڵو کەسانی دەرەوە هەر هەبێت تا هیوایان نەبڕێتو هەست بکەن کە رۆژێك هەر دەبێت بۆ ژیانی سەربەست بگەڕێنەوە لەبەر ئەوە نابێت بەهیچ جۆرێك ئەو رێگاو پردانە بپچڕێن کە بە هۆیانەوە پەیوەندی بە بەندکراوەکانەوە دەکرێت ، زۆربەی رێگا گرنگەکان بۆ پەیوەندی کردن بریتین لەم شێوانەی خوارەوە :




**٢ – سەردان**

ئەوەی شایانی باسە زۆر گرنگە دەبێ لەسەردانی بەندکراوەکان پێ‌نەبڕێن و لەوکات و مێژووانەدا کە بۆ سەردان تەرخانکراون بەم بارەیەوە کەمتەرخەمی نەکرێت ، چونکە ئەو سەردانە دەبێتە هۆی ئەوەی بیرو هۆشیان بجووڵێننەوە هەست بەوە بکەن کە چۆن تاوان لە ماڵ و منداڵ و کەس‌وکاریان دووری خستوونەتەوە ، جگە لەوەی کە هەست دەکەن بە جۆرەی کەسانی تر سەربەستیان نی‌یەو بەهیچ جۆرێك ئاگادارنین و لە کۆمەڵایەتی ژیانەوە دابڕاون ، تەنها هەندێ دەنگوباس نەبێ کە لەسەردانەکەدا دەیبیستن .

**ب – نامە ناردن**

نامە ناردن و وەرگرتن لەگەڵ بەندی‌یەکاندا یەکێکە لەو ڕێگایانەی کە پەیوەندی لەگەڵیاندا ناپچڕێت و زوربەی سیستەمی بەندیخانەکان لە هەندێك وڵاتدا ڕێگا بە بەندکراوەکان دەدەن کە نامە بنێرن بۆ کەس و کاریان . . بۆ نموونە . . (فەرەنسا) بەڵام بە مەرجێك کە نامەکان بۆ خێزانەکانیان و باوکی‌یان و منداڵەکانیان ئاراستە بکرێت ، لەم نامە ناردنەش کات و مێژووی خۆی بۆ تەرخان کراوەو بەپێی ئەو سنورانەی کە یاسا بۆی داناون . جگە لەوەش دەتوانن نامە وەربگرن ، بەڵام ئەو نامانەی کە دەڕۆن و دێنەوە لەلایەن دەزگای بەڕیوەبردنی بەندیخانەکەوە دەکریتەوەو هەموو بەندکراوەکانیش مافی ئەوەیان هەیە نامەی داخراو ئاراستەی دادگاو دەزگای بەڕێوەبەرەکانی وڵات بکەن .

**ج – باروذۆخی بەرەڵلاکردنی نائاسایی (حالات الخروج الاستثنائية)**

هەندێك لە سیستەمی بەندیخانەکان ڕێگا دەدەن بە بەندکراوەکان کە بچنە دەرەوە بۆ ماوەی چەند کاتێك یان چەند ڕۆژێك ئەویش ئەگەر هاتوو یەکێك لە کەس‌وکاریان مردبێت یان لەگیاندا نابێت ، بەڵام بە مەرجێك پەیمانێکی نوسراو بدات کە بۆ بەندیخانە دەگەڕێتەوە ئەمە بەهەل نەزانێت ڕابکات .

**د – ئامادەبوون بۆ گوزەران کردنی سەربەستانە (التهيؤ للحياة الحرة)**

هەندیك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان سیستەمی بەندخانەکانیان ڕێگە بەبەندکراوەکانیان دەدات بەتایبەتی ئەوانەی زۆربەی ماوەی بەندێتی‌یان تەواوکردووەو ڕەوشت و هەڵس‌وکەوتی‌یان هیچ لەکەیەکی پێوەنی‌یە بچنە دەرەوەو دەتوانن ئیش‌وکار بکەن بە مەرجێك ئێواران بۆ بەندیخانە بگەڕێنەوە . چاکەی ئەم سیستەمە ئەمەیە کە بەندکراوەکان وورده وورده بۆ گوزەران کردنی سەربەستانە ئامادە دەبن و ژیانێکی کۆمەڵایەتی پڕ لە خۆشی و ئاسایش لەگەڵ هەموو چینەکانی کۆمەڵدا .

**هـ – بەرەڵلاکردن لە بەندیخانە بە مەرج (الافراج الشرطي)**

هەندێك وڵات هەن کە زۆر بڕوایان بە بەرەڵلاکردنی بەندەکان هەیە ، بەڵام بە مەرج بەتایبەتی ئەو بەندکراوانەی کە زۆربەی ماوەی بەندێتی یەکەیان تەواوکردووەو ڕەوشت و جوڵانەوەیان چاك بووە لەو ماوەیەی کە لە بەندیخانە ماوەتەوە . . لەم وڵاتانە (عیراق) کە یاسای چۆنیەتی موحاکەمەکردنی سزایی نوێ (قانون اصول المحاكمات الجزائية الجديدة) ئەم ڕێگاو باوەڕەی گرتووە بە پێی بەندی ٣٣١ لە هەمان یاسادا . . بەندکراوەکان بە مەرج بەرەڵلا دەکات ئەو بەندانەی کە تەمەنیان نەبوو بە هەژدەساڵ دوو لەسەر سێ بەشی بەندێتی یەکەیان تەواو کردووە ، هەروەها ئەو بەندانەی کە لە هەژدە ساڵ زیاترن و سێ بەشی ماوەی بەندێتی‌یەکەیان تەواو کردووە . . ئەم بەرەڵلاکردنەش لەبەندیخانە دەبێ بڕیارێکی دادگایی پێ دەرچێت ، بەڵام ئەو ماوەیەی کە ماوەتەوە وەکو قەرز وەهایە لەسەر ئەو بەندکراوە کە لە بەندیخانە دەرچووە هەر کاتێك گەڕایەوە تاوانێکی کرد دادگاکان ئەو ماوە قەرزەشی بۆ ئەخەنە سەر ئەو ماوە تازەیەی کە تاوانکارەکەی پێ بەند ئەکرێت لەسەر سزای تاوانە تازەکەی . .

• بۆ ئەم نووسینەم سوودم لە گۆڤاری (البحوث الاجتماعية والجنائية) ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٧٢ وەرگرتووە .

# پەندو قسەی نەستەقی ناوچەی خانەقین

● شەكراو

پەندو قسەی نەستەق كوردی بەشێكی گرنگی ئەدەبی فولكلورە . لە هەموو بەشەكانی تری ئەدەب زیاتر بایەخی پێدراوەو پسپۆران وشارەزایان گەلێ لێكۆڵینەوەیان لەمەر كردووە .

پەندو قسەی نەستەق كوردی لە هەموو ناوچەكانی كوردستاندا بلاوو بایەخ پێدراوەو هەر ناوچەیەكیش بەشێوەی خۆی ئەو پەندانە دەردەبڕێت و پەندەكانیش لە ڕوخسارا لە ناوچایەكەوە بۆ ناوچەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لە ناوەڕۆكدا وەك یەكن . جا ناوچەی خانەقین وەك مەڵبەندێكی گرنگ لە كوردستاندا گەلێ ئەم جۆرە پەندانەی تیا درووست بووەو بلاوبۆتەوە كە لەڕووی شێوەوە لە شێوەكانی تر جیاوازە . زیانو بیرو فەلسەفەی گەلی ڕەنگ داوەتەوە .

بەگشتی ئەم پەندانە لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە مرۆڤ پەروەردە دەكات و لاوانی كۆمەڵ فێری چەندە واتەی بەنرخ و بەسوود بۆ پێك گەیاندنیان دەكات .

ئەم كۆمەڵە پەندە لە بەڕێز كاك حەمە ڕەحیم م وەرگرتووە كە دانیشتووی خانەقینەو خوێندەوارە تەمەنی سی ساڵە ، ئەویش لە باوكی و كەسوكاریەوە گوێی لێبووەو وەری گرتووە .

١ - ئەرا ئەوس كەفتە حەوز
٢ - ئەوەنە بەو و بچوو قەدرد نەچووگ
٣ - ئاوو ئاگر ئەمانیان نی‌یە
٤ - چوی درێدەی پینەی بكە
٥ - خودا پا وەماد نەیەگ
٦ - خەر باری تفەنگەو گورگ خوەدەی
٧ - لەئاو تاف مەترس هەڵهەڵەدەرە
لەئاو مەن بترس ئایم قویت دەرە
٨ كاسە وەكو چوید وەشوین كوچلە
٩ - شایەر وەنیشتن ماڵی ویرانە
١٠ - دروو ماڵ كی ڕمانیە
١١ - قەلاً وەقەلاً ئویشد ڕوی ڕەش
١٢ - گیرەكەر پای پەنی‌یە
١٣ - من كوڕ غەم بیم غەم ناوم نابە وغەم ناوكم بڕی وغەم بەرگمە
١٤ - زوان بگر سەر سەلامەتە
١٥ - نوومای دیرم ساڵ نیمە لەناچاری سواری بیمە
١٦ - هەركە دیری خوداو بەنە دوسی دیری
١٧ - لەوسا زانستم كارەگەمان سسە
خوازمەنی كەرمان پیرە خیزە
١٨ - چل نەفەر لەوەر مفاریگ وون دەیبانە مل بی‌كەسی
١٩ - ئائاقل وویار وویار كرد شیت لەئاو پەڕیەو
٢٠ - چوو هەلگر سەگ دز دیارە
٢١ - پارەی چەرمگ ئەرا ڕۆژ سیەش
٢٢ - بچوو نان بخوە خەر بزە ئاوە
٢٣ - خەر هەر خەرە بەس جلەگەی گوڕیاس
٢٤ - حووشتر وەنوقوڵ چە
٢٥ - حووشتر وەهوڵەچە
٢٦ - یەكیگ نەزانست لەماڵ خوەی حەلوا بكەد چوی لەماڵ هاوسا پلاو كرد .
٢٧ - وەخاسە خاسە ڕیایە كاسە
٢٨ - هەرچی فرە گەرە بەختی شەرە
٢٩ - نان بدە وەسەگ نەوە سفڵە
٣٠ - تا دوێتە نەكەی بوری بوری كوڕە نێكەی كار زووری
٣١ - ئەدەب لە مناڵ ئەزیزترە
٣٢ - پەیمانەی تەواو پڕ بووگە
٣٣ - خەر بتوید سویر سەگە
٣٤ - زگی نان گەنم هەڵ نی‌یەگری
٣٥ - زاوا خەر خەسو برەس
٣٦ - عەلی نەود وەلی نەود خودا خوداداری خوەی كەیگ
٣٧ - مار حەز نەكرد لە پیونگە پیونگە لەدەر گوناگەی سەوز بووی
٣٨٧ - لەوەرەو باجی لەپشتەو قەیچی
٣٩ - ماڵ پیر . . . شەر یە ودویر
٤٠ - كەس وەماسەگەی خوەی نائویشد توورشە
٤١ - شەوار شووم لە ئیوارە دیارە
٤٢ - ڕووی لویشی كلاشە

٤٣ - ئەگەر بەد نەود شەل و كوور لەباوە نێمیند
٤٤ - ئویشید میرگ لە گووی‌ی خۆی دیسەو
٤٥ - ئونیم كزنەو لەدلیا وەشیاگە
٤٦ - وەل لوویت خوەیەو شەر كرد
٤٧ - هاوساگەد بپرس ماڵەكەد بسینەو
٤٨ - وەوی كەس لەوەرەو خێرا نەود
٤٩ - ووتە ڤاتر باوگد كی‌یە
ووت خاڵوم ئەسپە

٥٠ – برا لەپشت برا بورد دوشمن با هەزار بورد
٥١ – زەنگ‌ر زەنگەنە دەلۆی خەتاکار
نان بدە وەسەگ نەوە وەرمزیار
٥٢ – رەفیق بن کیفلم تاپویل دیرید رەفیقلم
٥٣ – موریژە خۆی چەس و قەپی چەس
٥٤ – لەجیی بەرز بنیشەو قسەی قەوی بویشە
٥٥ – ریوی کی شایەتلە روت دویچگم
٥٦ – مانگ وەچەو دیارە وەدەس ئیشارە کریەد
٥٧ – ریوی دەمی وەهەلجیر نەرەسی روت کەرەکە دایە
٥٨ – گورگ گورگی‌کەی . . روژنیک‌و بەد پشت وە یەلەکەی
٥٩ – لەوەختی راو گوری تید
٦٠ – مەل گوشت خورە دەنویکی چەلەە
٦١ – دیوار موش دیرد موشیش گوش دیرد
٦٢ – دار هەنگویر وەختای بەرگرد مل چەمند
٦٣ – سەر نەچوروگ کلاو فرەس
٦٤ – گەورە ئاورشند بویچلک پاخشند
٦٥ – گەنم لەمریز کور لەژان خیز

فەرهەنگوکی هەندێ لە ووشەکان :

نەیەلە : نەیدات
خەر : کەر
خوەدەی : دەی‌خوات
ئاف : خور
مەن : مەنگ – وەسناو
ئایەم : ئادەمیزاد – مرۆڤ
قویت دەرە . قوت دەدەمات دەخنکێ
کوچلە : سەرەکەی قەپاخەکەی
رمان : رووخان
لویشد : دەڵێ
قەلا : قەلەرەشکە
گیوەکە : دزم
نومای دیرم : کەری‌یەلە سالە (واتە کەرێکی یەلە سالەم هەیە
سال نیمە : سال و نیوێکە
دیری : دەولەمەند ، خاوەنداو زەنگین
یەلە : یەندە عەبد
دوسی‌دیری : خۆشی دەوی
سە : خراپە
مەلریگ : ئەشکەوت
دەبیانە : دەلیم وەلت ؟ ئیانم بە ملت

ویار : جۆگەی ئاو
شەنگە : شێت
چرو هەلگر : دار هەڵگرت
چەرمگ : سپی
سیەس : رەش
خەربزە : کالەک
گورپاس : گوڕاوە
هرلەچە : واتە گیرەی پێ ناکرێ (پەگیرەچی)
ریابە کاسە : پیسایی لێ‌کرد
فرە گەرە : زۆر گەرا
سفلە : سپلە ، بێوەفا ، هیچی لە بەرچاوی لێ‌یە
بوری بوری : سەرەتاتکێ
پەیانە : پێك ، پیاڵە
سوپر : شایی
بچید : بچۆینت
کەیگ : دەکات
لەوەرەو : لەرووەوە ، لەپێشەوە
قەیچی : مقەست
مالپیر : شەریە و دوپر (واتە لە مالی پیر پێوەچاغ دووورکەوە یا ئووشی شەر نەبی
ماسەگەی : ماست
شووم : ناخۆش ، ئەگبەت ، بەدبەخت
لویشی : دەڵێی
باوە : باوك
نیمەند : نامێنی
میرگ : مووروو
تونم : ئۆی کینە ، رق
وەشیاگە : پلاو دەکاتەوە
وەوی : بوك
قاتر : ئیستر
وەرمزیار : (ئیرەیەکی جافە)
بن کیفلم : بن باخەلم
موریژە : مێرووله
دویچگم : کلکم
وەچەو : وەچەو
کەرەکە دایە : کەرووری داوە
روژنیک : ناخۆشی
موش : مشك
هەنگویر : ترێ
نەچوروگ : نەچێ
بویچلک : بچووك
هریز : فریز

# قسەی پێشینان

## پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئیدیۆمی کوردی

بەدران ئەحمەد حەبیب

قسەی پێشینان - زۆربەیان ، بەرهەمی سەردەمێکی کۆنن . قسەی ئەوتۆ هەیە بەسەدان ساڵە دەگوترێ و خەڵك دەماودەمی پێ‌دەکەن . ئەم قسانە سەرەتا لە رووبەری بچووکی گوندێك . هەوار و بنەگەیەك . تاکەماڵێکەوە سەریان هەڵداوە و پاشان پەڕ بوونەتە رووبەرێکی گەورەتر و خەڵکێکی فرەتر ناسیوویانە و بەکاریان هێناوە .

خەڵك ، قسەی پێشینانیان پشتاوپشت لەناو بیرولەسەر زاری خۆیان هەڵگرتووەو ، مشتومالّو کۆك و پوختەیان کردوون ، وشەی زیادەیان لێ‌هەڵاواردوون ، وشەی لەسەرزار ناخۆشیان لێ لاداون و بە وشەی لە بارتر و لەسەرزار سووك شوێنیان پڕ کردوونەتەوە . نەك هەر تەنیا قسەی پێشینان بگرە سەرجەم داهێنانی خەڵکی گۆڕان بەسەر شێوەی زارگۆتنەکەیدا هاتووەو ، ئەو شێوە گوتنەی دواجار پێی هاتۆتە نووسین ئەو شێوەیە نەبووە کە لە سەرەتادا پێی دارێژراوە . ئەگەر ئەم دیاردەیە لە قسەی پێشیناندا کەمتر بێ ئەوا لە گۆرانی و بەیت و لاوك و هەموو شتێکی بەشیعر هۆنراوەدا پتر بووەولە پەخشانیشدا لە هەموویان پتر بووە .

کۆنێتی قسەی پێشنیان بووەتە هۆی ئەوەی خاوەنی بنەرەتیان دیار نەمێنێ و بێ سامان و کلووری تێکرای خەڵك . لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ پەند و قسەی نەستەق هەن بە ناوی خاوەنی خۆیانەوە ناسراون یان دراونەتە پاڵ کەسانێکی ناسراو . بە تایبەتی ئەوانەی لەم سەردەمانەی دواییدا گوتراون تا ئێستاش ناوی خاوەنەکانیان بەسەر زاری خەڵکەوەیە .

ئەوانەی تا ئێستا قسەی پێشینانیان کۆکردۆتەوە ، پەند و قسەی نەستەق و ئیدیۆمیان تێکەڵ کردووە و لە یەکتریان جودا نەکردونەتەوە . هەرچەندە جودا کردنەوەی تەواوی ئەم سێ بابەتە کارێکی تاسەر ئاسان نیە و گەلێك ئاڵۆزیی تێدایە بەڵام هاوێر کردن و لەیەکتر جوداکردنەوەی پەند و قسەی نەستەق پێشینان و ئیدیۆم دەبێتە یارمەتیدەرێکی چاکی ئەو کەسانەی لە دوارۆژدا بیانەوێ بەجودا لەبارەی هەریەکێ لەم بابەتانەوە بنووسن یان بیانەوێ لەبەر تیشکی قسەی پێشینانەوە لە ژیانی کوردەواری و بیرو زمانی کوردی بکۆڵنەوە .

وا لێرەدا کۆششێکی سەرەتایی لەم بارەیەوە پێشکێش دەکەین و بە هیواین ببێتە هەنگاوێك بۆ ئەوانەی بیانەوێ لەم بوارەدا پتر پێوە بچن .

**پەندی پێشینان (الامثال) :**

پەند لە بەسەرهاتی کۆنەوە وەرگیراوە . بەسەرهات ، سەرەتا لەزاری تاکە کەسێك و لە ناوچەیەکی بچووکەوە سەری هەڵداوە و پاشان کەوتۆتە سەر زاری

خەڵك و لەم ناوچەیەوە پەڕیووەتە ناوچەی تر و مرۆگەلێکی گەورەتر پێیان زانیووە . خەڵك ، نەوە دوای نەوە ، سنگ بە سنگ و پشت بە پشت ئەم بەسەرهاتانەیان هەڵگرتووەو پاراستوویانە و دەرس پەندیان لێوە وەرگرتوون . بەسەرهاتی پێشین ، ئەگەر ئەم دەرس و پەندە سەنگینو گرنگانەیان تێدا نەبوایە هەرگیز ئەو سەدان سالانە بەسەر زاری خەڵکەوە نەدەگەڕان و هەر زوو دەمردن .

سەرچاوەو بەسەرهاتی پەندی پێشینان یان ڕووداوی بەڕاستین و لە کاتو شوێنێکی دیاریدا بەسەر کەسێ یان کۆمەڵێ هاتوون ، یان چیرۆکی ئەفسانەیی و دەمهەڵبەستن و خەڵك بە خەیاڵی خۆیان هەڵیانبەستوون و دەماودەمیان پێ کردوون .

پەند لە بنەڕەتدا گوتەیەکە لەناو کرۆکی بەسەرهاتێکەوە وەرگیراوە بەزاری کەسێکەوە گوتراوە و گرنگترین گوتەی ناو ئەو بەسەرهاتەیە . پێشینان بۆ کورتکردنەوەی کات ئەم گوتەیەیان لەو بەسەرهاتەوە وەرگرتووە و کردوویانە بە ئاماژە (ئیشارەت) بۆ بە بیرهێنانەوەی ئەو بەسەرهاتە . گوێگر بە بیستنی ئەو گوتە – ئاماژەیە دەسبەجێ ئەو بەسەرهاتەی هاتۆتەوە بیر و ، دەرس و پەندی تاقیکراوەی ناو ئەو بەسەرهاتە هەڵوەستەی پێکردووە و ئاسۆی بیری فراوانتر کردووە . پەند لە ڕواڵەتدا هیچ واتایەك بەدەستەوە نادا . بەبێ زانینو ناسینەوەی بەسەرهات و ئەو سەرچاوەیەی پەندێکی تایبەتی لێوە وەرگیراوە تێگەیشتنی ئەو پەندە شتێکی لەتوانا بەدەرە . هەر لەبەر ئەمەیە پەند و بەسەرهاتی پەند لەو ڕۆژەوەی داکەوتوون تا ئەمڕۆ شان بەشانی یەکتر دەژین و ، پێکەوە بەسەر زاری خەڵکەوەن . بۆ بەڵگە ، ئەم پەندانەی خوارەوە بە نموونە دەنووسینەوە .

(١) هەباسە ، لە دیوانان چ باسە ! [١] .
(٢) خۆت هەڵتەکێنە بارت سەنگینە ! [٢]
(٣) زەرەری بۆ پەزی نیە ؟[٣]
(٤) سم سمی کەرە و چنگ چنگی مەیاسە ،
سەرم سوڕماوە لەم باسو خواسە ! [٤]
(٥) گەزی چی و جاوی چی ؟[٥]
(٦) سووریلەی خڕیلە ، هەنجیرانیش ئەخوا و درۆیانیش ئەکا ! [٦]
(٧) کێ ئەم زەنگوڵە لە ملی پشیلە دەکا ؟[٧]
(٨) خزمی خەزووری سەپانی شێخە ! [٨]
(٩) دایکت بمرێ گوڵوەشان ! [٩]
(١٠) های لە قوونێ ، وای لە دۆشاوی ! [١٠]
(١١) چ کەویژێ ، چ مەویژێ ! [١١]
(١٢) مەیکوتە جەوتە .[١٢]
(١٣) بانێکە و دوو هەوایە .
(١٤) خوا لە سوڵتان مەحموود گەورەترە[١٣]
(١٥) شیردا لۆ داپیر دا[١٤]
(١٦) کێشە لەسەر لێفەی مەلایە
(١٧) هەتا مەلا مەلا بوو ئێرە بوار بوو .
(١٨) ڕەحمەت لە کفندز .
(١٩) جافر تیا ڕیایە .
. . . هتد .

وا لە خوارەوە بەسەرهاتی هەندێك پەندی پێشینان دەنووسین :

**(١) هەمووی لەسەر (شەمێ) یە و شەمێش ئاگای لە هیچ نیە !**

لەو ناو مەنگوڕایەتییە ژنێك هەبوو «شەمێ»ی ناو بوو – ئای ڕاست ئای درۆ – شەمێ ناوی بەخراپ دەرچوو بوو ، ڕۆژێك خزمەکانی شەمێ و بوختیانکەرەکان بە تفەنگ ئەنیشنە ناو یەك و دەست ئەکەن بە کوشتاری یەك ! شەمێ کە وا ئەزانێ هەڵدێت و ڕووبارێك ئەبێ لە ڕووبارەکە ئەپەڕێتەوە ، لەو کاتەدا زەلامێکیش لەوبەر ئاوەکە دێت و گوێی لە تەق و هۆڕی تفەنگی ئاوایی ئەبێ ، لە شەمێ ئەپرسێ : دایکم ! ئەم تەقە و کوشتار و هەرایە لەسەر چیە و بۆ چیە ! شەمێش ئەڵێ : «بەخوا برام ئەوە هەمووی لەسەر شەمێ و شەمێش ئاگای لە هیچ نیە !»[١٥]

**(٢) پاش و پێش ، لەنگوچك و تلێش !**

جاران خەڵك کەوڵی بەرخیان دەکردە فەروا و زستانان لەبەریان دەکرد تا ئەوەی خۆیان لە سەرماوسۆڵەی زستان بشێرنەوە . ڕۆژێك ، ڕێوی فەروایەکی لەم جۆرەی دەست دەکەوێ و دەیبا لەبەر زارکی کونی خۆی فەرواکە لەبەر هەڵدەکێشێ . لەو کاتەدا گورگ بەوێدا ڕادەبوورێ و سەری لەم بەرگەی ڕێوی سوڕدەمێنێ ، دەڵێ : «مام ڕێوی ئەمە چیە لەخۆتەوە پێچاوە» ؟ ڕێوی دەڵێ «چی بێ لە تۆ نهێنی بێ مام گورگ ئەوا خۆت دەزانی پیر بووین و توانای بەرگرتنەی سەرماو بەفرو کڕێوەی زستانمان پێوە نەماوە ! منیش گوتم با ئەم فەروایە بۆ خۆم ببڕم و تا سەرماو سۆڵەکە بەسەر دەچێ لەبەری بکەم» .

گورگ گوتی : «هیزە مام ڕێوی دەستم بە داوێنت بەڵکو شتێکی ئاواش من دروست بکەی !» ڕێوی گوتی : «باشە بەسەر چاو ، بەڵام خۆت دەزانی ئەم فەروایە لە هیچە دروست ناکرێ .» گورگ گوتی : «چۆن !» . ڕێوی گوتی : «دەبێ هەر ڕۆژەی بەرخێکی تیسکنی گۆشتنم بۆ بێنی و منیش کەوڵی بکەم و کەوڵەکەی بۆ تۆ بکەم بە فەروا . جا چەند بەرخی تێ بچێ ئەوا دەبێ بیهێنی» گورگ دەڵێ : «لەمە ئاسانتر نیە !» .

ئیدی هەموو ڕۆژێ گورگ بەرخێکی دوونگ ئەستووری تیسکنی گۆشتن مێگەلی ئەو ناوە دەرفێنێو دەیهێنێ لەبەر دەمی ماڵی مام ڕێوی دەیدا بە زەویدا ڕێویی فێڵبازیش کەلەشی بەرخەکە دەباتە ژوورەوە و گۆشتەکەی دەخوا . فەرو

...رواش لە گۆزێدا نیە . ئەم هاتوچۆیەی گورگ زوری پێ دەچێ و هەموو رۆژ ...رخێکی نوێ بۆ رێویی فێڵباز دەهێنێ ، لەبەردەم کونی مامرێوی دەوەستێ و ...ەیێ : «ها ! مام رێوی چیت کرد ؟ فەرواکەم تەواو نەبوو ؟ بەفر و سەرما ...نمی .»

...ێویش دەڵێ : «برۆ بەرخی تر بێنە ، هیچی ئەوتۆی نەماوە» .

...ورگ دەڵێ : «باشە پێم ناڵێی چی ماوە ؟»

...ێوی دەڵێ : «پاش و پێش ، ئەنگوچك و تلێش[16]» .

(واتە هیچی نەکراوە ، بەڵام گورگ لە مەبەست ناگا ، بەر دەکاتە دواوە و ...ەروا بەرخی تر بێنێ) .

۳) **سمۆرە گوێ** :

...لە دار کەوتمە خوار دوو منم کەم کرد . پرسیان : تۆ خۆت نیو من نابی ئەم ...وو منەت لە کوێ هێنا . گوتی : کاکی خۆم هەرکەسەو بە منی خۆی[17] .

٤) گاران بە گاوانەوە دەرۆیشت . پیرێژن لە گۆلکە سوورەی دەپێچایەوە !

**...سەی نەستەق (حکم)** :

بە پێناسە ، قسەی نەستەق فەلسەفەی بەرەسەن خۆماڵیی خەڵکی ...ەخوێندەوار بووە . لە دنیادیتەیی و تاقیکراوەی ژیانی هەزاران ساڵەی پێشینانەوە سەری هەڵداوە و بوونە بەڵگەی دانایی و فرەزانی و ئەزموونديتەیی ئەوان . ئەم قسانە ، دەبێ سەرەتا لەلابەن تاکە کەسێك (کەسێکی دنیا دیتە ، داناو دوولا و بە ئەزموون) ەوە گوترابن و پاشان چووبنە سەر زاری خەڵك و دەماودەمیان پێ کرابێ . دیارە خەڵك نەیانتوانیوە بە درێژایی ئەو هەموو سەدان ساڵانە ناوی خاوەن قسەی نەستەق (هەروەها پەندیش) بپارێزن و لە یادی نەکەن ، رەنگە هەر پێویستیشیان بەو ناوانە نەبووبێ . ئەرکی ئەوان پاراستن و لە نەوە بۆ نەوە هەڵگرتنی بووە . لەگەڵ ئەمەشدا گەلێ جار قسەی پیاوێکی زانا و لێهاتوو ، ...ێکی زۆرزان . یان تاکە شیعری شاعیرێك بوونەتە قسەی نەستەق و ئێستا ئەم قسانە بە ناوی خاوەنی خۆیانەوە ناسراون . پێشینان بە هۆی ئەم قسەی ...ەستەقانەوە بیری نەوەی تازەوەچیان فرچك‌داوە و زمانیان پێ گۆش کردوون .

وەك دەردەکەوێ ، قسەی نەستەق بەپێی سەرچاوەی پەیدابوونیانەوە دەکرێن بە سێ بەش :

**یەکەم** : ئەوانەی لە دووبارە بوونەوەی دیاردەی رۆژانەوە هاتوون :

لەو رۆژەوەی مرۆڤ پێی ناوەتە ناو ژیانەوە ، گوزەرانی بەیێکەوەیی و ...ەکۆمەڵایەتی لەگەڵ هاورەگەزی خۆی و ، پێوەندیی بە گیانلەبەرانی ماڵی و ...کێوییەوەو ، هەڵسوکەوتی خوی لەتەك سروشتی دەوروبەردا بوونەتە سەرچاوەی ...ەر و زانینی . دیاردەیەکی سەیرو تایبەت یان چەندبارە بوونەوەی چەندین ...دیاردەی ناو ژیانی کۆمەڵ و سروشت سەرنجی مرۆڤ بەکێش کردووە و هەڵوەستەی پێ کردووە . سەرەنجام ئەم دیاردە تایبەتە یان چەندبارە بوونەوەی ئەو دیاردانەی ...ێ بووەتە باسای لە دەوروبەر گەیشتن و لەژیان نۆرین[18] :

(۱) ئاشی نەزان خوا دەیگێرێ .

(۲) ئاشەوان چ دۆست چ دوژمن ئاشباری خۆی دەستێنێ .

(۳) ئەگەر دز و ماڵاخۆ یەك بن گا لە کولانکەوە ئاوا دەکەن .

(٤) ئەوەی لە شەر نەبێ شێری تیژە .

(٥) ئەوەی بە زارو دەوە ، مەزنێ گوندی ئەوە

(٦) ئەقڵی سووك باری گران .

(۷) ئەوەی حوشترەوان مێوانی بێ دەبێ سەردەرەی دەرکەی بڵند بێ .

(۸) ئەوەی لە دیزە بێ دێتە ئەسکوو

(۹) بەرد بشکێنە ، دوو روو مەدوێنە

(۱۰) بە ساڵ دەچی ، بە سوڵتان دەچی

(۱۱) بڕووشی مێردان بە نۆر دەکولێ .

(۱۲) بەرخ‌هەر لەژێر سەوەدا[19] نابێ .

(۱۳) بێ‌کراس خەو بە گەزە جاوەوە دەبینێ .

(١٤) باویلێ[20] بایەکی بەسە .

(۱٥) بەپشیلەیان گوت : گووت بە دەرمانە ! دەچوو دەیشێردەوە

(۱٦) پێنجك چوارە بە ژمارە .

(۱۷) تازە هات ، کۆنە خەڵاتە .

(۱۸) زانا بە یەك پێ پێوە دەبێ ، نەزان بە دوو پێ .

(۱۹) حەوت جار بگر ، جارێك ببڕ

(۲۰) خەتێ خوار لە بن سەری گای پیرە

(۲۱) خوام لێ لارە ، بەندەم لێ بێزارە .

(۲۲) دایکی دز جارێك سینگ دەخوا و جارێك سینگ دەکوتێ .

(۲۳) دەستەوەستان ، چ لە گەرمێن چ لە کوێستان

(۲٤) دیزەی بە دەستی کابان بشکێ تەقەی نابێ

(۲٥) دیزە گوتی : بنم زێڕینە . ئەسکوو گوتی ئەدی من لە کوێم

(۲٦) داری بریا بەر ناگرێ .

(۲۷) دۆم بە دانیشتن ماڵی وێرانە

(۲۸) دایکە بینەو دۆتە بخوازە ، دڵت نەکاتن هیچ پەرەوازە .

(۲۹) دۆی ئەزموو[21] لە ماستی نائەزموو چاترە .

(۳۰) ژن بخوازە لە ماڵان ، خوارزا دەچنە دووی خاڵان .

(۳۱) سەرچۆپی بکەوێتە دەستی سەگ بۆ لای سەبەتەی نانی دەبا .

(۳۲) سواری خەڵکی پیادەیە

(۳۳) شەر لە شۆ نەك لە تۆ

(۳٤) شەر لە شەرگە

(۳٦) شین و شایی دەستەوایی

(۳۷) سەرێ گۆتە زمانێ : هەتا تۆم بێ جیرانێ ، خوشی نابینم لە ژیانێ

(۳۸) دیاریی شوانەوێڵە یان شنگە یان هەڵەکۆك

(٣٩) دار دەڵێ : تەور کلکی لە خۆم نەبوایە هەرگیز نەیدەبڕیمەوە
(٤٠) دار کرمی لە خۆی نەبێ هەزارساڵ دەژی .
(٤١) کتك و مشك ، برا و خوشك .
(٤٢) کەری چاك دەکەوێتە کن گڵفرۆش
(٤٣) کیژی بە دایك ، دیزەی بە دەرخۆنەیە
(٤٤) کەندەلان دەرمێ کوێرەشیو پردەبێتەوە
(٤٥) کەوای قوتنی ، ئاستەری جاوە
(٤٦) کەرم دا بە کەرێ . سندان لە چاوی دەرێ .
(٤٧) کەرت چاك بێ ، چەندی بار بەرۆ
ژنت چاك بێ ، چەندی کار کەرۆ
(٤٨) گۆڕ بە ئەنگوست گەورە نابێ
(٤٩) گەنمە هەرێ ، جۆیە هەرێ ، هەرزنە ترنە توش هەر هەرێ
(٥٠) گوتیان : شێتە ! بۆ شێتی ؟ گوتی : بۆم دەلوێ
(٥١) گوتیان : شەودز چاترە یان ڕۆژدز ؟ گوتی ئەوەی بیبێنی
(٥٢) لە باوان دەنگ ، لە خەزووران ڕەنگ
(٥٣) لەگەڵ عامێ ، دەچمە شامێ
(٥٤) مانگا ئەگەر بە دۆ دەبوو لە دەرکەی ماخۆ دەبوو
(٥٥) مست لە درێشە دەگەڕێتەوە
(٥٦) مانگا بە دزی کەڵ دەگرێ بە ئاشکرا دەزێ
(٥٧) ماڵی بە لاباران ، ئاگانە هەواران
(٥٨) ماڵی خۆت چاك هەڵگرە ، سەگی هامسا بە دز مەگرە.
(٥٩) مانگ لە ئادار ، بەفر بیارێ هەتا گەڵای دار ، نامێنێ هەتا ئێوار
(٦٠) ماین بە توورەگەی بەتاڵ ناگیرێ
(٦١) نە ناکەسان بکە بە کەس ، نە کوێراوان بکە بە ڕەس[٢٢]
(٦٢) ناوم چووە بە گوڵی ، تەوقم چووە لە ملی
(٦٣) نۆکەری بێ خەڵات ، تانجی سەری ئاغایەتی
(٦٤) نازیان نا لە پیاز ، پیاز کردیە گازەگاز
(٦٥) ماینیان ناڵ دەکرد ، قرژاڵ پێی بڵند دەکرد
(٦٦) ناوبژیوان پشووی فراوانە
(٦٧) نە یار دەبێ لە گوێن دایك ، نە شار دەبێ لە گوێن بەغدا
(٦٨) هەویر لە شێلانێ ، ئەنگوتك لە کابانێ ، نانێ لە نیوانێ
(٦٩) هاوینان شل‌وملی ، زستانان جواڵ لە ملی
هەندێك قسەی نەستەق بە خاوەن :

(١) (خلك)ی مستەفای پیرەوبسی شاتری ئەلێ :
«قسە بیگێڕە ، بیبێژە ، بیوێژە !»[٢٣]
(٢) شوکری فەزلی دەڵێ :
سەرەتای ئیش هەموو یەکبوونە ، ئەویش نابێ
هەتا هەر برینێ کە لە دڵدا هەیە سارێژی نەکەی
(٣) حاجی قادری کۆیی دەڵێ :
چاوەکەم تۆش پیر دەبی ڕیشت دەبێتە گوڕەوی

**دووەم : ئەوانەی سەرچاوەیان لە پەندی پێشینانەوەیە**

هەندێ جار نیشانە و بۆنی (پەندایەتی) لە هەندێ قسەی پێشیناندا سەرهەڵدەدەن و وا پێ دەچێ ئەمانە لە بنەڕەتدا پێوەندییان بە چیرۆك و بەسەرهاتێکی ڕووداوی کات و شوێنێکەوە هەبووبێ . واتە لە بنەڕەتدا پەند بووبن و پاشان لە پەندایەتی شۆڕابن و چووبنە ژێر پێناسەی قسەی نەستەقەوە . دیارە بڵاوبوونەوەی پەند بە ناوچەیەکی فراواندا و تێپەڕینی ڕۆژگارێکی زۆر بەسەر ڕووداوی ئەو پەندەدا وردە وردە بەسەرهاتی پەندەکەی لە بیری خەڵك بردبێتەوەو ، بەشێوەیەکی سەربەخۆ و لە ڕووداوە کۆنەکە ژیاندبێتی ، تا ئەوەی بەسەرهاتی ئەوپەندە بەتەواوی لە بیری خەڵك چووبێتەوە . خەڵك بۆ خۆیشیان ڕەنگە قسەی نەستەقیان وەك دانابێ ، پتر پێویست بووبێ تا پەندی پێشینان . پەند لە لایەکەوە ئەو فرەزانی و فەلسەفەی لە دنیانوڕینەی قسەی نەستەق لەگەڵ خۆی هەڵناگرێ و لایەکی تریشەوە پەند بە خۆی و بە چیرۆك و بەسەرهاتی – هەندێك جار ، درێژ دادڕیەوە کات و دەرفەتی لە خەڵك ویستووە . لەوا نەیە خەڵك لە هەموو کات و سەردەمێکدا حەزیان لە کورتبڕی کردبێ . بۆ نموونە ئەم قسانەی خوارەوە .

(١) پوورێ دەچێ بۆ مردن مووروو دەکا لە گەردن
(٢) ئەگەر شەعبانە و ئەگەر ڕەمەزانو ، جەم مێرەم هەر دوو نانە
(٣) نانێکی خواردووە بە ڕۆنەوە ، هاتووە بەو پێ و شۆنەرە
(٤) هەموو کەس نانی خۆش دەویست ، گاوان لەسەر دڵی دادەنا
(٥) کەچەڵ تری ، بەش خوی بڕی
(٦) شەڕ لە بادینان تۆز لە دەرکێ مە
(٧) مەڕم نەدیتیە لە هەوێزێ ، قشپلم دیتیە لە پەرێزێ

**سێیەم : قسەی بە توێکڵ**

هەندێ قسەی نەستەق لە شێوەی قسەی بە توێکڵ یان قسەی (ئەنتیکە) دان . ئەمانە ڕواڵەتێکی گاڵتە ئامێز و خۆشیان هەیە و خاوەن قسە بۆ دەربڕینی مەبەست و بۆ چوونی خۆی پەنای بۆ ئەم شێوەی قسە خۆشانە بردووە و لە بنەڕەتدا مەبەستێکی گەورەتری دەربڕیووە .

زۆربەی ئەم قسە بە توێکڵانە بە ناوی خاوەنیانەوە ناسراون یان دەدرێنە پاڵ کەسانێکی ناسراو ، واتە لەم سەردەمانەی دواییدا ڕوویانداوە ، ئەوانەیش خاوەنیان دیار نیە دەبێ تەمەنیان گەورە بێ و لە سەردەمێکی کۆنتردا گوترا بن . هەندێك نموونە :

(١) مەلا ڕەشیدی چیچۆرانی لە سەگ زۆر ئەترسا ، تەنانەت لە تووتکیش هەر ئەترسا ! پێیان ئەوت : کابرا ! ئاخر تووتك چیە تۆ لیی ئەترسی ؟ ئەیوت : «من لە خۆی ناترسم ، لەوە ئەترسم کە (گەماڵ)م لێ خەبەر ئەکاتەوە !»[24]

(٢) مەلا «عیسا»ی هەرتەل هەبوو ، هەموو جار ئەیوت :
«خوا گەڵی ئیشان ئەکا ، ئەزی تێدا شەرمەزار ئەبم !»[25]

(٣) پیاوێکی لەك هەبوو ئەگەر پێناسەی ژنی بکردایە دەیگوت :
«ئەوەی نیەتی ئەڕای سووتیایە ، ئەوەی هەیەتی تیای سووتیایە !»

(٤) پیاوێك لە ژنەکەی دەپرسێ : چی خۆشە لە دنیا ؟ ژنەش لە وەڵامدا دەڵێ :
«زستانان بەز و ئەز ، بە هاران پەز و ئەز ، هاوینان تەز و ئەز ، پاییزان ڕەز و ئەز !»

(٥) مەحموود پاشای جاف ئەڵێ : پیاوێکی ژیرم ئەوێ بینێرم بۆ شار بۆ لای حوکمەت فەقێ شێتە لەوێ ئەبێ ، ئەڵێ :
«پاشا ، هەر کە ئەقڵی بوو لەم دیواخانە دەرچوو !»[26]

## ئیدیۆم

**بە پێناسەی زمانەوانی ، ئیدیۆم بریتیە لە وشەیەك یان دووان یان پتر و بە ڕواڵەت واتایەکی ئاشکرای هەیە و لە مەبەستدا واتایەکی تر دەگەیەنێ . بۆ نموونە :**

(١) ئارداوی : بریتیە لە تۆمەت بەخۆ کردن . دەڵێن : کابرا لە هیچی نەبوو خۆی ئارداوی دەکا .
(٢) ئاگر خۆش کردن : بریتیە لە شەڕ بەرپاکردن و دنەدان بۆ هەرا و کێشە
(٣) ئەنگوتك بژێر : خەسیس و ڕژد
(٤) ئەستێ و پووشوو : بریتیە لە دژایەتی توند : (ئەو دووانە پێکەوە ئەستێ و پووشوون) .
(٥) ئاسنی سارد کوتان : کاری بێ ئەنجام کردن .

ئیدیۆم بە دیمانە و بە ڕواڵەت لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق دەچێ ، ئەمیش وەك ئەوان لە سەردەمێکی کۆنەوە پەیدا بووە ، ئەوە نەبێ کە ئیدیۆم دیاردەیەکی زمانەوانیە و بۆ مەبەستی ڕەوانبێژی هاتۆتە ئاراوە و پێشینان گەڵی جار بۆ گەیاندنی مەبەستێك پەنایان بردۆتە بەر قسەی بە پەردە و کینایەت و نەیانویستووە ڕەپوڕاست مەبەست دەربڕن . بۆیێکە ئیدیۆم دارشتەیەکی ئاڵۆزی هەیە و زۆرجار لێکۆڵەوە و کۆکەرەوەی پەند و قسەی نەستەق بە هەڵە بردووەو لەتەك ئەماندا خۆی بە تۆمارکردن داوە .

بۆ نموونە ئەم ئیدیۆمانەی خوارەوە :
(١) با لە کوێوە بێ لەوێوە شەن دەکا : بە هەر شێوەیەك بێ کاروباری هەڵدەسووڕێ .
(٢) لە قسان ئاڵی زەنگانە ، لەکاران ڕیخ بە لینگانە : لە بڕێتی خۆهەڵکێشی هیچ لەدەست نەهاتوو .

**(٣) دەم تەڕی کاسەوشك : لە بڕێتی کەسێ بەڵێنی زۆر بەم و بەو بدا و وەکی تریش هیچی بەجێ نەگەینێ .**
**(٤) ڕووبەڕوو دەمچەور ، پاشملە دەمتەور : لە بڕێتی مرۆڤی دووڕوو . لە ڕوودا دۆست و لە پاشملە ناحەز .**
**(٥) حەوتێ بڕێ لە باوان ، کلەی ناپڕێ لە چاوان : کەسێ بە هیچ کارەساتێك تەمی گرتوو نەبێ بێعار .**
**(٦) دیزە بەکۆڵە : کەسێ هەڵومەرجی زۆر ناسکی هەبێ .**

**(٧) باران بیارێ ئاشی دەگەڕێ ، باران نەبارێ جووتی دەگەڕێ : لە بڕێتی کەسێ لە هەموو هەڵومەرجێکدا باری ڕاست بێ و کاری لە گەڕدابێ .**
**(٨) کەرکولێ و بارسووك : لە بڕێتی کەسێکی سەرئاسوودە ، بێ گیروگرفت**
**(٩) ئاگای لە مەحموودی بێزەواڵ نیە : بێئاگایە .**

**مێژووی بایەخ پێدانی ئیدیۆم لە ناو کورد لە مێژووی پەند و قسەی نەستەق کۆنترە . شاعیرانی کۆن (بەتایبەتی حاجی قادری کۆیی) بۆ مەبەستی ڕەوانبێژی پەنایان بۆ ئیدیۆم بردووە و گەڵی ئیدیۆمیان خستۆتە نێوانی دوو توێی شیعرەوەو لە پەنای قسەی بە پەردەوە مەبەست و واتایان دەربڕیوە .**

چەند نموونەی ئیدیۆمێك لە شیعری (حاجی) :

**(١) ئاگری بن کا : لە بڕێتی کەسێ لە ژێرەوە کاری نابەجێ بکا .**
هەتا وەك (ئاگری بن کا) ن لەگەڵ یەك
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان ، بە پووشەك

**(٢) ئاردی ناو دڕك :** لە بڕێتی پەرژ و بڵاوبوونەوەی شتێ کە ئیتر کۆنەبێتەوە .
ئەو زەمانی (بوونە ئاردی نێو دڕك)
پارەیەك ناکا دووسەد جار بێتە ڕك

**(٣) تری بن گۆم :** لە بڕێتی شتێ ون بێ و هیچ سەر و سۆراغی نەبێ .
ئەدیب و عاقڵی لەم بەحرە وەك (تری بن گۆم)
گەلێکی ون بووە . حاجی وەچاکە لێی دەرچین

**(٤) لە گوێی گا نووستن :** بێئاگایی ، بێ خەبەری لە دنیا
(لە گوێی گا نوستوون بۆیێکە ڕێوی
لەسەر ئێوە وەها شێرگیرە وەك سەگ

**نموونەی هەندێ ئیدیۆمی تر لە زمانی کوردیدا :**

**(١) سەری نایەشێ پەڕۆی تێوە دەپێچێ : لە هیچە گرفت بۆ خۆی دەنێتەوە .**
**(٢) لە پشت بەردیکەرە : بێئاگایە .**
**(٣) باراشی لە هەموو ئاشێکە : دەم لە هەموو کارێکەوە دەژەنێ .**
**(٤) بەرماڵی بەسەر ئاوەوە دەگەڕێ : موسڵمانێکی چاکە ، پاك و لەخوا ترسە .**
**(٥) کای کۆن بەبا کردن : زۆرپاتە کردنەوەی بابەت و باسی بێ کەڵك و کات بەسەرچوو**

(٦) کێج کەوتنە کەوڵ : نەحەجمین ، ئارام لێ بڕان

(٧) شیر و تیر لێك سووین : دوژمنایەتی . نێوان ناخۆشی

(٨) دیزە بە دەرخۆنە کردن : شێردنەوەی ناپەسەندییەك .

(٩) پێ لە تەختەی چرووك نان : کاری ناشایستە کردن

(١٠) بوون بە بەردی بن گۆم : ون بوون ، بێ سەر و شوون بوون

(١١) دانوو پێکەوە نەکولاّن : پێکەوە هەڵنەکردن ، نەگونجان .

**دوا سەرنج !**

بخوێنی بەرێزم : دوای ئەوەی پێناسەی سەربەخۆی پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئیدیۆممان پێشکێش کرد و ، لە ڕەوشت و ناوەرۆك و مەبەستی بەکارهێنانی هەرسێیان دواین و ژمارەیەکی زۆر نموونەمان بۆ هێنانەوە ، حەزدەکەم سەرنجت بۆ دیاردەیەك بەکێش بکەم ئەویش بەکارهاتنی هەندێ جاری پەندی پێشینانە وەك ئدیۆم و گۆڕانی هەندی قسەی نەستەقە بۆ ئیدیۆم . ئەم باسە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی پێ دەوێ و هەڵی دەگرین بۆ کاتێکی تر ، لێرەدا تەنیا چەند نموونەیەك بۆ ئەم دیاردەیە دەهێنینەوە :

(١) کێ ئەم زەنگوڵە لە مل پشیلە دەکا ؟ پەندە (بەسەرهاتی هەیە) .

زەنگوڵ لە ملی پشیلە کردن (ئیدیۆم) : لە بریتی خۆ لە مەترسی دان .

(٢) دەوەنی پێ کرد بە ئاش ! پەندە (بەسەرهاتی هەیە) .

دەوەن پێ بەئاش کردن (ئیدیۆم) : لە بریتی هاندان و تووڕەکردنی کەسێ بۆ ئەوەی کارێکی نابەجێ بکا .

(٣) ڕیسی لێ بووەوە بە خوری ! پەندە (ڕووداوی هەیە) .

ڕیس لێ بوونەوە بە خوری : لە بریتی لێ هەڵوەشانەوەی کاروباری .

(٤) تری بن گۆم دەنگی نایێ . قسەی نەستەقە

بوون بە تری بن گۆم : نێ سەروسەودا بوونی کەسێ یان ڕووداوێ .

پەراوێز و سەرچاوە :

(١) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : علاء الدین سجادی ، ڕشتەی مرواری ، بەرگی یەکەم ، بەغدا . چاپخانەی (مەعارف) - ١٩٥٧ ، ل - ٤٦ .

(٢) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ٩٥

(٣) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٠٧

(٤) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١١٥

(٥) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٧٠

(٦) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی دووەم ، بەغدا . چاپخانەی (مەعارف) - ١٩٥٧ ، ل - ١١٩

(٧) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی چوارەم ، بەغدا ، چاپخانەی (مەعارف) - ١٩٦٩ ، ل - ٧١

(٨) بۆ بەسەر هاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی پێنجەم ، بەغدا ، چاپخانەی (مەعارف) - ١٩٧٢ ، ل - ٥٤ .

(٩) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٤٤

(١٠) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : شێخ محمدی خال ، پەندی پێشینان ، سلێمانی ١٩٧٠ ، ل - ٤٥٩

(١١) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٧٤

(١٢) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو ، ل - ٤٣٤

(١٣) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : محمد مظفرپەی ئۆسکارمان . پێشکەکی و ساغکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی : هێمن موکریانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل - ١٨٥

(١٤) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : محمد کرم شریف ، ئەفسانەی کوردەواری ، بەغدا ١٩٨٥ ، ل - ١٥٠

(١٥) بۆ بەسەرهاتی ئەم پەندە بڕوانە : علاء الدین سجادی ، سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی پێنجەم ، ل - ٧

(١٦) ئەم پەندە و بەسەرهاتەکەیم بە منداڵی لە زمانی باپیرەمەوە بیستووە . تلێش یان تلیش : لیرێز ، لاتەنیشت .

ئەم پەندەم بە شێوەیەکی تریش لە زمانی خەڵکەوە بیستووە : (ئەم تەنیشت و ئەو تەنشت ، هەردوو قۆڵ و ڕاستە پشت) .

(١٧) (من) یان (مەن) جۆرە کێشێکی کۆن بووە .

(١٨) کەرەستەکانی ئەم بەشەم بەم شێوەیە کۆکردووەتەوە : زۆربەیان لە زمانی دایکمەوە و بەشێکیانم لە کاك (عبدولکەریم حوسێن عەونەیی) وەرگرت کە ئەویش لە زمانی دایکیەوە تۆماری کردبوون و ، بەشی سێیەم لە کاتی خوێندنەوەی کوردی لە لای خۆم نووسیبوومەوە . ئەمانە یان بڵاونەکراونەتەوە یان جیاوازییەك لە نێوانی ئەمانە و ئەوانی بڵاوکراوەدا هەیە .

(١٩) سەوە : سەوەشیر ، جۆرە سەبەتەیەك بوو لە ماڵی خاوەن مەڕو بزن ، بە سەر مەنجەڵی شیری هەوێن کراودا ئەخرون دەکرایەوە بۆ ئەوەی نەرژێ یان سەگ و شیلە نزیکی نەبنەوە . هەندێ جار کارو بەرخی تازە زاوێشیان دەخستە ژێر ئەم سەبەتەیەوە و بە پارچە جلێك دایاندەپۆشی بۆ ئەوەی سەرمایاندوو نەبێ .

(٢٠) باوێلێ : بایێلێ ، پشیلۆکە ، پشیلە پایزە ، گوڵی وشکەوەبووی پشکووتووی درکەزەردەیە ، پایزان بەدەم سووکە بایەکەوە لە بنە دەوەنەکەی خۆی دەبێتەوە .

(٢١) ئەزمرو : ئەزموودە ، ئەزموونراو ، تاقیکراوە .

(٢٢) ڕەس : ڕەز (بۆ ڕاگرتنی سەروا بەم شێوەیە گۆڕاوە)

هەروەها ئەم قسەیە بە شێوەیەکی تریش دەگوترێ :

کوێرەکانیان مەکەن بە باخ ، ناکەس بەچەان مەکەن بە چراخ ، قەت لە پاش چووان مەڵێن ئاخ . چراخ : جێگەی پەنا هانا .

(٢٣) علاء الدین سجادی . دەقەکانی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد . بەغدا ١٩٧٨ ، ل - ١٥٩

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٦٢

(٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٦١

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل - ١٦١



# لە دارســـــتاندا

شانۆنامەیەکی رەمزی‌یە
نووسینی عبد الصمد خانقاه
وەرگێڕانی عباس عبد الله یوسف

## دیمەنی یەکەم

(دارستانێکی تاری‌ی بە چڕەدرەخت ، تیشکەهەتاوی بۆ ناچیٚ)

شێر : «بە دەنگێکی بەرز دەنەڕڕێنیٚ» ئەی مەیموونەکە لە کوێ‌ی ؟

مەیموون : «بەلەزو بە بازەباز لە پۆپی درختێکی بەرزەوە دێتەخوارەوە» من «دەمی تێك دەئالیٚ» من ، من ، لێرەم (پی‌ی دەکەوێتە سەر زەوی‌و بە کڕنۆشەوە لە دیاریدا دەوەستیٚ) .

: گەورەم چی دەویٚ ؟

شێر : «بەتووڕەیی چاوی لیٚ‌زەق دەکات) وا خەریکە لە برسان بمرین ، بێعار ، خۆراك بێنە ، تێگەیشتی کرێت ؟

مەیموون «(چەند بازێك داویٚ) : بەلیٚ بەلیٚ سەروەرم «وون دەبێت»

شێر : «لە نەڕەنەڕی ترسناکی بە هەمەلا ڕۆی‌دا بەردەوام دەبێت» گوێم لە قیڕە قیڕە ئەمەکی‌یە لەویٚ ، کی‌یە لەویٚ ؟

بۆق : (بەیەك باز دەبگاتیٚ‌و دادەکەوێت) من ، من ، گەورەم

شێر : «لی‌ی نزیك دەبێتەوە ، هەناسە گەرمە شێدارەکەی لە پێستەی بۆقەکە دەدات) جا ، ئەی بیانی‌یە چاوقایمەکە چیت دەویٚ ؟

بۆق : (بە سەر پی‌یەکانی دادەکەوی‌و ماچیان دەکات) من ، من ، من ، بەرپارێزگاری ئێوەم دەویٚ ؟

من زۆر لێکراوم ، چەوساوەم لە دارستانەکەماندا .

شێر : (بە لووتی دەپرخێنیٚ) ئا . . باشە کەواتە بەلاٚم بۆ؟

بۆق : «بەخۆشی‌یەکەوە) چونکە وایان بڕوایە ، کەوا من گشت قەوزەی ڕۆخ گۆمەکەم بە تالاٚن بردووە .

شێر : ئەی ئەو گۆمە لە کوێ‌یە ؟ سەیرە چۆن پێم نەزانیوە منی کەوا هەتاو لەسەر زەوی‌وزارما ئاوا نابیٚ .

بۆق : ئەریٚ ، هەر لەبەر ئەوەندە هاتوومەتە لاتان من بەر بەرزەفرمانی ئێوەم ، ئایا سەروەرم دەیەویٚ ئەو گۆمی پی‌نیشان دەم ؟ هەروەها دارستانەکە ؟ و ماسیە نەفامە شۆرش کردووەکانە ؟

شێر : هەوکە من ماندووم ، جێگرم دەنێرم ، زۆر لامان ئازیزە ، دیمەنە جوانەکەی دڵخۆشتان دەکات ئەو مەیموونێکی سوعبەتچی‌یە ، مەیموونەکە خۆی لە کارەکە دەکۆڵێتەوە ، دڵنیا بە ، من پشتوانتم . لە هیچ شتیٚ مەترسە ، ئێستا بڕۆوە ، دووای ماوەیێ دەبیٚ بگەڕێیتەوە ، جا مەیموونەکە لە گەڵتا دەچیٚ .

بۆق : «پڕ دەداتە پی‌یەکانی‌و بە زێدەگەرمی‌و دڵسۆزی‌یەوە ماچیان دەکات» سوپاس ئەی سەروەرم ، ئەی مەزنی بیٚ‌هێزو زۆرلێکراوان (دەڕواتەوە) .

مەیموون : (بەتاو غار دەدات ، لا بە لا دادێت‌و دەگاتە شوێنی شێرەکە) سەروەرم ، هەندە هێلکەم بۆت هاوردووە ، مریشکان جەنگێکی بیٚ ئامانیان لەسەرم پەرپا کرد . ئەی ئەم پەڵە خوێنانەی سەر لاشەم نابینی ؟ ئەمانە جیٚ شوێنی دندووکی مریشکە بریندارکەرەوەکانە .

شێر : (هێلکەکانی لیٚ‌دەردێنیٚ) ناهومێد مەبە ، لە مریشکان دەترسی‌ی ؟ وەی وەی لەبەر تۆ ، جا دەبیٚ من کیٚ بم ؟ (دەست دەکات بە لرف کردنی هێلکەکان) .

مەیموون : (دوور دەکەوێتەوەو ئەختێك پالٚ دەکەویٚ) ئای ئەمرۆ من زۆر ماندووم .

شێر : ئەمرۆ بۆقێك هاتە لام ، داوای پاراستنی کرد هەوکە ئامادە دەبێت ، تۆش لەسەرتە لە گەڵیدا بڕۆی ، بۆ ناوبژێوانی کردن‌و چەسپاندنی بەرپارێزگاری ، تی‌گەیشتی ؟ گێل مەبە .

